چاپی سێیەم

ئەحکامی

# حەج و عومرە

لە ڕوانگەی مەزهەبی ئیمامی شافیعییەوە


دانراوی:

حاجی مامۆستا مەلا ئەحمەد ڕۆستەمی

ئامادە کردنی:

مەلا ڕەفیق ڕۆستەمی

پیدا چوونەوەی:

مونیبن ڕۆستەمی

# ئەحکامی حەج و عومرە

دانراوی:

**حاجی مامۆستا مەلا ئەحمەد ڕۆستەمی**

مودەڕڕیسی پێشووی مەدرەسەی ئیمامی شافیعی
گوندی «دەگاشێخان» ناوچەی مەریوان

پیاچوونەوەی «مۆمن» ڕۆستەمی

**ناسنامەی کتێب:**

**ناوی کتێب: ئەحکامی حەج و عومرە**

**دانروای: حاجی مامۆستا ئەحمەدی ڕۆستەمی**

**ژمارەی چاپ کراو: ٢٠٠٠ دانە**

**ژمارەی لاپەڕە و فەوارە: ١٤٤ لاپەڕەی گیرفانی**

نافرۆشرێت، لە ڕێی خوادا بڵاو ئەکرێتەوە.

ئەم کتێبە:

لەسەر ئـەرکی بـەڕێز و خـێرخـواز و خـوانـاس، جەنابی حەجی «نامیق دەهیش» کـوڕی مـەڕحوومی حاجی «عەلی» خەڵکی گوندی «وەیسە»، دانیشتووی شاری مەریوان، لە چاپ دراوە و بە خـۆڕایـی لەنـاو خــوێنەوارانـدا بـڵاو ئـەکـرێتەوە. لە خـوای گـەورە ئەپاڕێمەوە کە سەربەرز و سەرفەراز و بەختەوەری بکا و لە ژێر ئاڵای گەورەی پێغەمبەری خـوادا‌ﷺ زیـندوو بکرێتەوە و لەگەڵ چاکانا حەشر بکرێ و بە لیقای زاتی حــەق بگـەیێت و وێـنەیان بـۆ خـزمەتی ئـیسلام و موسوڵمانان زیاتر بکات.

# بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

**بەناوی خوای گەورە و میهرەبان**

الْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذي فَرَضَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ عَلَى الْإِنْسِ وَالْجِنِّ وَ قالَ: ﴿وَ أَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّٰهِ﴾ [1]، ﴿وَ أَذِّنْ فِي النّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجالاً وَ عَلىٰ كُلِّ ضامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ [2]، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلىٰ مَنْ أَرسَلَهُ وَ جَعَلَهُ خاتَمَ النَّبِيّينَ وَ خَيْرَ خَلْقِهِ مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحابِهِ وَ أُمَّتِهِ إِلىٰ يَوْمِ الدِّينِ

(١) بقره/١٩٦. (٢) حج/٢٧.

## پێشەکی

سەفەر و باروبنە پێچانەوە بۆ زیارەتی ماڵی خوا ئاواتی بەرزی هەر موسوڵمانێکی بە بیر و باوەڕە، بۆیە هەر ئیمانداریێ کە خوا منەت بنێتە سەری و ئەم سەفەرەی بۆ ئاسان بکا، تێ ئەکۆشێ ئەو ماوەیە کە لەوێ ئەمێنێتەوە تەنانەت با بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ زمانی لە زیکر و ویرد و «تَلبِیَه» و دۆعا و پاڕانەوە نەکەوێ؛ بەم بۆنەوە برایانی موسوڵمانی ناوچە (ئەوانەیان کە بۆ ئەم سەفەرە موبارەکە بەڕێ ئەکەون) داوایان لێ کردم کە ئەو دۆعا و ئەورادانە هەر لێرە هەتا ئەوێ کە سوننەت و پێویست و لازمە و ئاوات و ئارەزوو و نیاز و زەمزەمەی زمانی حاجی و عومرەگوزار بێت لە کتێبە فیقهییە موعتەبەرەکانا دەر بێنم و بۆیان بنووسمەوە، منیش بە پێویستم زانی کە نامیلکەیەك سووك و سەهل و بچکۆلانە بەڵام جامیعی هەموو ئاداب و ئەرکان و واجباتی حەج و عومرە و ئەو

دۆعــا و ئـەورادانـە بـێت کـە لە ئـەحادیس و کـتێبە فیقهییەکانا هاتوون، بە میزانی ڕێبازی ئیمامی شافیعی کۆتا و موختەسەر بنووسم تـا بـرایـانی مـوسوڵمانی هاوزمانم بتوانن ئەو دوعاو ئەورادانە کـە زەمـزەمەی زمان و دڵ و دەروونی حاجیان و عومرەگوزارانە بـە سەهلی و ئاسانی ڕچاویان بکەن و بیانخوێننەوە و بە باشی ئەحکامەکانی حـەج و عـومرە بـبەن بـەڕێوە و عومرە و حەجێکی مەبڕووڕ و سەعییێکی مەشکووریان بـە نـەسیب بـبێت، وە ئـێمەیش لە دۆعـای خـێریان فەرامۆش نەکەن.

حـاجیانی بەڕێـز و عومرەگوزارانی ئـازیز بـزانـن! ڕەهــبەری نـــازدار فـەرموویەتی: کـەسێ بـە نـیەتی حەجکردن یا عومرەکردن لە ماڵی خۆی بڕواتە دەرەوە بەڵام بۆی ڕێك نەکەوێ حەج و عومرە بکات و فەوت بکات، ئەوە خـوای گـەورە هـەرچـی سـاڵە حــەج و عومرەیەکی بۆ ئەنووسێت. وە هەر کەس لە مەککە یان

لە مەدینەدا فەوت بکات حسابی لەگەڵ ناکرێ و پێی ئەوترێ بڕۆ بۆ بەهەشت. کەسێ حەج بکا زوبان و باقی ئەندامەکانی بە وتاری ناڕەوا و کار و باری زشت و ناپەسەندەوە ئالوودە نەبن، ئەوە لە تەواوی گوناهان پاك ئەبێتەوە هەروەك ئەو ڕۆژەی کە لە دایك بووە.

ئەوانە کە حەج یا عومرە ئەکەن وەفد و نێرراو و هەڵبژاردە و زیارەتکەری خودان. ئەگەر داوای هەر شتێکی لێ بکەن پێیان ئەبەخشێ، ئەگەر داوای لێخۆشبوون بکەن لێیان خۆش ئەبێ، وە ئەگەر بۆ هەر مەبەستێك لێی بپاڕنەوە موستەجاب ئەبێ، وە ئەگەر داوای شەفاعەت بکەن شەفاعەتەکەیان قوبووڵ ئەبێ.

ئاگاداری! ئەنجامدانی یەك عومرە لە مانگی ڕەمەزاندا سەوابی یەك حەجی هەیە، بەڵام لە غەیری ڕەمەزاندا سێ عومرە جا سەوابی یەك حەجی هەیە.

«عبداللّه بن عباس» رضي الله عنه وەسیەتی بۆ منداڵەکانی کردووە و پێی فەرموون: بە پیادە حەج بکەن چوون بۆ

هەر هەنگاوێك کە حاجی ئەینێ حەوسەد حەسەنەی حەرەمی بۆ ئەنووسن. پرسیاریان لێ‌کرد حەسەنەی حەرەم چۆنە؟ لە جوابدا فەرموویان: هەر حەسەنەیەکی حەرەم یەکسەدهەزار حەسەنەی غەیری حەرەمە، خولاسە بۆ هەر هەنگاوێ حەفتا ملیۆن حەسەنەی بۆ ئەنووسن.

وەهەبی کوڕی مەنبە رضي الله عنه فەرموویەتی: لە تەوڕاتا نووسراوە: خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتا حەفتا هەزار مەلایکە ئەنێرێ بۆ خزمەتی «بيت الحرام» کە زنجیری تەڵایین بە دەستیانەوە هەیە، دەستووریان پێ ئەدرێ تا بەیت زنجیر بکەن و بیهێنن بۆ سەرای مەحشەر، ئەوانیش ئێن و زنجیری ئەکەن و ئەیانەوێ ڕایکێشن بۆ سەرای مەحشەر، بەڵام بەیت ئەفەرموێ: تا خودای گەورە هیوا و ئاوات و ئارەزووم جێ‌بەجێ نەکا و ڕازیم نەکا نایێم، جا مەلائیکەیەك لە ئاسمانەوە بانگی لێ ئەکا و پێی ئەفەرموێ: هەرچی مەیل و ئارەزووتە

داوای بكە، بەيتيش ئەفەرموێ يارەبی ئەمەوێ ئەوانەی
كە وان لە دەور و بەری مندا و هاوسێی منن عەفوويان
بكەی و بمكەی بە تكاكار و شافيعيان، خودای
گەورەيش ئەفەرموێ: ئەوا هەمووويان بە خاتری تۆ
عەفوو كران و بەخشران، جا تەواوی مردووانی شاری
مەككە بە ڕووی سپی و ليباسی ئيحرامەوە دەوری ماڵی
خودا ئەدەن و تەلبيە ئەكەن، ئەمجا مەلائيكەيەك
ئەفەرموێ: ئەی ماڵی خودا بەرەو سەرای مەحشەر
بكەوەرە ڕێ، دووبارە ماڵی خودا ئەفەرموێت: تا
مەتڵەب و ئاوات و ئارەزووم بە تەواوی جێبەجێ
نەكرێ و ڕازی نەكريم نايیم. بەڵێ مەلائيكەيەك لە
ئاسمانەوە ئەفەرموێ: ئەی «بيت الحرام» هەرچی
مەيل و ئاوات و مەتڵەب و ئارەزووتە لە خوای گەورە
داوای بكە، جا «بيت الحرام» ئەفەرموێ: يارەبی
ئەمەوێ كە من بكەی بە شافيعی ئەوانەيش كە تەركی
ماڵ و مناڵ و دوستانيان كردووە و لە نزيك و دوورەوە

هاتوون و تۆزاوی بوون و زیارەتی منیان بە عـیشق و عەلاقەوە کردووە و مـەناسیکی حـەجیان بـە ئـەمر و فرمانی تۆ ڕچاو کردووە. جا خودای گەورە ئەفەرموێ: ئەی «بیت الحرام» ئەوا هەرچی ئارەزووتە پـێت‌دراو تۆم کرد بە شافیعی هەموویان و عەفووم کردن، ئەمجا لە ئاسمانەوە مەلائیکە بانگەواز ئـەکـا و ئـەفەرموێ: هەرکەس زیارەتی ماڵ خوای کردووە با لە مەردوم جیا ببێتەوە، جا ئەوانەی کە زیارەتی ماڵی خوایان کردووە لە مەردوم جیا ئەبنەوە و بە ئەمری خودا دێن بۆ دەوری ماڵی خودا و دەست ئەکەن بە تەواف و تەلبیە کردن و ئەمین ئەبن لە ئاوری دۆزەخ و سزای گەورە، جا «بیت الحرام» بە ئارەزوو و ئاوات و مەتڵەبی دیرینەی خۆی ئەگا و ڕازی ئەبێ، مەلائیکەیەك لە ئاسمانەوە بانگ ئەکا ئەفەرموێ: ئەی «بیت الحرام» بەرەو سەرای مەحشەر بکەوەرە ڕێ، جا «بیت الحـرام»یش ئـیتاعە ئـەکـا و ئەکەوێتە ڕێ و لە خۆشیدا ئەفەرموێ: «لبّیك اللهم لبیك

و الخير كله بيدك، لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد و النعمة لك و الملك، لاشريك لك». ئەزرەقی ڕیوایەتی لە «ابن المسيّب»وەكرووەكە فەرموویەتی: هەركەسیٚ بە ئیمان و ئیخلاسەوە تەماشای بەیت بكا لە گوناھ پاك ئەبێتەوە وەكوو ئەو ڕۆژە كە لە دایك بووە. بەیهەقی لە شەعبی ئیماندا ڕیوایەتی كردووە كە خوای گەورە هەرچی ڕۆژە یەكسەد و بیست ڕەحمەت ئەبارێنیٚ بەسەر بەیتا، شەست ڕەحمەتی بۆ تەواف كەرانە، چل ڕەحمەتی بۆ نوێژ كەرانە، بیستی بۆ تەماشا كەرانە.

***

ئەی كەسیٚ كە ئەتەویٚ ئاداب و ئەحكامی حەج و عومرە بە باشی ڕچاو بكەی ئەبیٚ بزانی:

* ـ وەختێك لە دەرگای ماڵ هاتیتە دەرەوە سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنی: «بِسْمِ اللّٰهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّٰهِ وَ لا حَوْلَ وَ لا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ أَوْ أَذِلَّ أَوْ أُذَلَّ أَوْ أَزَلَّ أَوْ أُزِلَّ أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ أَوْ أَجْهَلَ

أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ، اللّٰهُمَّ إِنِّي لَمْ أَخْرُجْ أَشَراً وَ لَا بَطَراً وَ لَا رِيَاءً وَ لَا سُمْعَةً بَلْ خَرَجْتُ اتِّقَاءَ سَخَطِكَ وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِكَ وَ قَضَاءَ فَرْضِكَ وَاتِّبَاعَ سُنَّةِ نَبِيِّكَ وَ شَوْقاً إِلَىٰ لِقَائِكَ». بەناوی خوا، بە خوا تەوەککول ئەبەسم و گەڕانەوە لەسەر گوناه و قودرەت لەسەر تاعەت نیە، مەگەر بە خوا نەبێ، ئەی خوایا، خۆم ئەپارێزم بە تۆ لەوە کە ڕێگەی نادروست بە کەس نیشان بدەم یا پێم نیشان بدەن، یا کەسێ زەلیل کەم یا کەسێ زەلیلم بکا، یا کەسێ هەڵخلیسکێنم یا هەڵمخلیسکێنن، یا ستەم لە کەسێ بکەم یا زوڵمم لێ بکەن، یا کەسێ بە جەهلا بکێشم یا بە جەهلا بمکێشن، یاڕەببی بەڕاستی بۆ ئەوە نارۆم کە لە خۆشیدا بم یا تەکەببور یا ڕیابکەم، یا خەڵکی بۆم بڕوانن و گوێم لێ بگرن، بەڵکوو بۆ ئەوە ئەڕۆم کە لە عەزابت بمپارێزی، ڕەزایەتی تۆ هیوا و ئارەزوو و ئاواتمە و فەرزت جێبەجێ ئەکەم و شوێنی ڕێباز و ڕەوشتی پێغەمبەرەکەت ئەکەوم و عیشق و

شەوق و مەیل و مەرامم هەرگەیشتن بە تۆیە.

*ـ وەختێ كە سواری سەیارە یا تەیارە ئەبیت سوننەتە ئەم دۆعایە بخوینی: «بِسْمِ اللّٰهِ وَ بِاللّٰهِ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّٰهِ وَ لا حَوْلَ وَ لا قُوَّةَ إِلّا بِاللّٰهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ، مٰا شٰاءَاللّٰهُ كٰانَ وَ مٰا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ، سُبْحٰانَ الَّذي سَخَّرَ لَنٰا هٰذٰا وَ مٰا كُنّٰا لَهُ مُقْرِنِينَ وَ إِنّٰا إِلىٰ رَبِّنٰا لَمُنْقَلِبُونَ، اللّٰهُمَّ إِنّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ إِلَيْكَ وَ فَوَّضْتُ أَمْري إِلَيْكَ وَ تَوَكَّلْتُ في جَميعِ أُمُوري إِلَيْكَ أَنْتَ حَسْبي وَ نِعْمَ الْوَكيلُ». بەناوی خوا، خوا گەورەیە و تەوەككول لەسەر خوا ئەبەستم، گەڕانەوە لە گوناه و قودرەت لەسەر تاعەت هەر بە خوایە، هەرچی مەیل و ئارەزووی لێبێ ئەبێ و هەرچی ئارەزووی لێ نەبێ نابێ، پاك و دووری لە كەموكووڕی هەر بۆ ئەو خوایەتە كە ئەم مەركەبەی بۆ ئێمە ڕام كردووە، ئێمە ناتوانین رامی كەین، بەڕاستی ئێمە بۆلای خوای خۆمان ئەگەڕینەوە، ئەی خوایا بۆ خزمەتی تۆدێم و هەرچی

ئەمر و فرمانی خۆمە ئەیدەمە دەستی تۆ، بۆ تـەواوی کارەکانم تەوەککول و پشت هەر بە تۆ ئەبەستم و تۆ بۆ من کافی و بەسی و باشترین وەکیلی.

*- کاتێك ئەچیتە سەر بەرزی سونەتە بە دەنگی بەرز سێ جار «اللّٰهُ أَكْبَرُ» بکەیت و ئـەم دۆعـایەش بخوێنی: «اللّٰهُمَّ لَكَ الشَّرَفُ عَلىٰ كُلِّ شَرَفٍ وَ لَكَ الْحَمْدُ عَلىٰ كُلِّ حَالٍ». ئەی خوایا، هەر بۆ تۆیە گـەورەیی و بەڕێزی و بەرزی بەسەر هەموو بەڕێزێکا و لەبۆ تـۆیە حەمد و ستایش لە هەموو حاڵێکدا.

*- کاتێك کە ئیحرام ئەبەستی سونەتە ئەم دۆعایە بـخوێنی: «لَبَّيْكَ اللّٰهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ والنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لا شَرِيكَ لَكَ، اللّٰهُمَّ أُرِيدُ الْحَجَّ فَيَسِّرْهُ لي وَ أَعِنِّي عَلىٰ أَداءِ فَرْضِهِ وَ تَقَبَّلْهُ مِنِّي، اللّٰهُمَّ إِنِّي نَوَيْتُ أَداءَ فَرِيضَتِكَ فِي الْحَجِّ فَاجْعَلْني مِـنَ الَّذِينَ اسْتَجابُوا لَكَ وَ آمَنُوا بِـوَعْدِكَ وَاتَّـبَعُوا أَمْـرَكَ وَاجْعَلْني مِنْ وَفْدِكَ الَّذِينَ رَضِيتَ عَنْهُمْ وَارْتَضَيْتَ وَ

قَبَّلْتَ مِنْهُمْ». ئەی خوایا، وام لە خزمەتتا، ئەی خوایا، وام لە خزمەتتا، ئەی خوایا وام لە خزمەتتا، شەریك و هاوەڵ بۆ تۆ نیە، وام لە خزمەتتا، بەڕاستی شوكر و ستایش و نیعمەت و تەواوی موڵك بۆ تۆیە و هاوەڵ و شەریكت نیە، یاڕەببی ئەمەوێ حەج بكەم، داوات لێ ئەكەم سەهلی كەی بۆم و یاریم بدەی تا بتوانم جێبەجێ بكەم و لێم قەبووڵ كەی و لێم وەرگری، ئەی خوایا، بەڕاستی قەسدی مەناسیكی حەجم هەیە و داوات لێ ئەكەم و ڕجام هەیە بمخەرە ناو ئەو كۆڕەوە كە ئیجابەی دەستووری تۆیان كردووە و بڕوایان بە وەعدی تۆ هەیە و پەیڕەوی لە دەستوور و یاسای تۆ ئەكەن، یاڕەببی داوات لێ ئەكەم و هیوا و ئاواتم ئەمەیە كە داخڵی ئەو كۆڕ و هۆزەم بكەی كە لێیان ڕازیت و ئەوان لە تۆ ڕازین و لێیان وەرئەگریت و لێیان قەبووڵ ئەكەیت.

❊ـ لە ئەووەڵی حەرەمەوە سوننەتە ئەم دۆعایە

بخوێنی: «اللّٰهُمَّ هٰذٰا حَرَمُكَ وَ أَمْنُكَ فَحَرِّمْ لَحْمي وَ دَمي وَ بَشَري عَلَى النّٰارِ وَ أَمِنّي مِنْ عَذٰابِكَ يَوْمَ تُبْعَثُ عِبٰادُكَ وَاجْعَلْني مِنْ أَوْلِيٰائِكَ وَ أَهْلِ طٰاعَتِكَ». ئەی خوای گەورە ئەمە حەرەمی تۆیە و ئەمانت داوە و جێگەی ئەمنە، داوات لێ ئەکەم و ڕجا و ئارەزووم ئەوەیە کە گۆشت و خوێن و پێستم لە ئاگری دۆزەخ بپارێزی و لە ڕۆژی قیامەتا ئەمینم کەی لە عەزابی خۆت، هیوا و ئارەزوو و ئاواتم ئەوەیە کە بمخەیتە ناو کۆڕی خۆشەویستانت و ئەهلی تاعەت و لەناو ئەواندا حەشرم بکەی.

## باسی چوونە ناو شاری مەککە

باشتر و گەورەتر وەهایە پێش وەستانی «عەرَفە» بچیتە ناو مەککەی پیرۆز. جا کاتێك واریدی شاری مەککە بووی سونەتە لە «ذي‌طوی»دا غوسڵ بکەی ئەگەر لە ڕێگەی مەدینەوە واریدی شار ببی، وەگەرنە لە هەر شوێنیکەوە واریدی شار بووی سونەتە هەر لەو

مەسیرەوە غوسڵ بکەی و فەوری بچی «طواف‌القدوم» ئەنجام بدەی.

بزانە، بۆ حاجی و غەیری حاجی سوننەتە لە ڕێگەی «کداء»ی سەرەوە بچێتە ناو مەککەی پیرۆز و لە ڕێگەی خوارەوە بچێتە دەرەوە.

※- کاتێك گەیشتیتە «رَدم» و چاوت کەوت بە «بیت‌الله» سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنی: «لَا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلٰامُ وَ مِنْكَ السَّلٰامُ وَ دٰارُكَ دٰارُ السَّلٰامُ، تَبٰارَكْتَ يٰا ذَاالْجَلٰالِ وَالْإِكْرٰامِ اللّٰهُمَّ إِنَّ هٰذٰا بَيْتُكَ عَظَّمْتَهُ وَ كَرَّمْتَهُ وَ شَرَّفْتَهُ اللّٰهُمَّ فَزِدْهُ تَعْظِيماً وَ تَشْرِيفاً وَ تَكْرِيماً وَ زِدْهُ مَهٰابَةً وَ زِدْ مَنْ حَجَّهُ بِرّاً وَ كِرٰامَةً. اللّٰهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوٰابَ رَحْمَتِكَ وَ أَدْخِلْنِي جَنَّتَكَ وَ أَعِذْنِي مِنَ الشَّيْطٰانِ الرَّجِيمِ». هیچ خوایەك نییە عیبادەتی بۆ بکرێ بە حەق بێجگە لە زاتی «الله» نەبێ، خوا گەورەیە، ئەی خوایا، تۆ سەلامەتی و هەر لە تۆوەیە سڵامەتی و ماڵی تۆ ماڵی سڵامەتییە و گەورەیی

هەر بۆ تۆیە، ئەی خاوەنی جەلالەت و کەرامەت، یارەببی ئەمە ماڵی تۆیە و من بە گەورە و بەرز و با شەرافەتی ئەزانم، ئەی خوای گەورە عەزەمەت و شەرافەت و هەیبەتی بۆ زیاد کە و چاکە و کەرامەتیش زیاد کە بۆ ئەو کەسەی کە زیارەتی ئەکات، ئەی خوایا، هیوا و ئاوات و ڕجام هەیە کە دەرگای ڕەحمەتت بۆم بکەیتەوە و بمخەیتە ناو بەهەشتی خۆتەوە و بمپارێزی لە شەیتانی ڕەجم کراو.

※ـ کاتێك لە «بابالسّلام»ەوە داخڵی «مسجدالحرام» ئەبیت سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنی: «بِسْمِ اللّٰهِ وَ بِاللّٰهِ وَ مِنَ اللّٰهِ وَ إِلَى اللّٰهِ وَ عَلىٰ مِلَّةِ رَسُولِ اللّٰهِ». بە ناوی خوا، بە زاتی خوا، ئەم نیعمەتە لە خواوە ئەزانم و بۆلای خوا هاتووم و لە ڕێی خوادا هاتووم و لەسەر دینی ڕەسوولی خوامﷺ

بزانە، کاتێ واریدی «مسجدالحرام» ئەبی نابێ دەس بکەی بە نوێژی «تحیّةالمسجد»، یا دەس بکەی

بە زیکر و قورئان خوێندن، بەڵکوو ئەبێ قەسدی «حجرالأسود» بکەی و فەوری دەس بکەی بە «طواف‌القدوم»، چوون تەواف سەوقاتی «مسجدالحرام»ە.

*-کاتێك لە ناو «مسجدالحرام»دا چاوت کەوت بە بەیت، سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنی: «اللّٰهُمَّ زِدْ هٰذَا الْبَيْتَ تَشْرِيفاً وَ تَعْظِيماً وَ تَكْرِيماً وَ مَهٰابَةً وَ زِدْ مَنْ شَرَّفَهُ وَ عَظَّمَهُ وَ مِمَّنْ حَجَّهُ أَوِ اعْتَمَرَهُ تَشْرِيفاً وَ تَكْرِيماً وَ تَعْظِيماً وَ بِرّاً، اللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلاٰمُ وَ مِنْكَ السَّلاٰمُ فَحَيِّنٰا رَبَّنٰا بِالسَّلاٰمِ». ئەی خوایا، ڕجام هەیە و داوات لێ ئەکەم بۆ ئەم ماڵە شەرافەت و عەزەمەت و کەڕامەت و هەیبەتی خۆت زیاد کەی، وە بۆ ئەوکەسەیش کە ماڵی تۆ بە گەورە ئەگرێ، شەرافەت و عەزەمەت و چاکە و باشەی بۆ زیادکەی، خوا حاجی بێ یا عومرەگوزار بێ، ئەی خوایا، تۆ سەلامەتی لە هەرچی کەموکووڕییە و سڵامەتی هەر بە دەستی تۆیە، ئەی خوایا، ڕجا و

ئارەزوو و ئـاوات و هـیوامـان ئـەوەیە بـە سـڵامەتی زیندوومان بکەیتەوە.

❊ـکاتێك نزیکی بەیت کـەوتیتەوە سـوننەتە ئـەم دۆعایە بخوێنی: «اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ وَالسَّلَامُ عَلٰى عِبَادِهِ الَّذِيْنَ اصْطَفٰى، اللّٰهُمَّ صَلِّ عَلٰى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَ رَسُولِكَ وَ عَلٰى إِبْرَاهِيمَ خَلِيلِكَ وَ عَلٰى جَمِيعِ أَنْبِيَائِكَ وَ رَسُولِكَ، اللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِي مَقَامِي هٰذَا فِي أَوَّلِ مَنَاسِكِي أَنْ تَقَبَّلَ تَوْبَتِي وَ أَنْ تَتَجَاوَزَ عَنْ خَطِيئَتِي وَ تَضَعَ عَنِّي وِزْرِي، اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي بَلَّغَنِي بَيْتَهُ الْحَرَامَ الَّذِي جَعَلَهُ مَثَابَةً لِلنَّاسِ وَ أَمْناً وَ جَعَلَهُ مُبَارَكاً وَ هُدًى لِلْعَالَمِينَ».
حەمد و سـتایش هـەر بـۆ زاتـی خـوایـە و درووود و ڕەحمەت بۆ ئەو بەندانەی کە خوا هەڵیبژاردوون، ئەی خوای گەورە، ڕجا و ئارەزوو و ئاواتمان ئـەمەیە کـە ڕەحمەت بڕژێـنیٚ بەسەر گەورە و سـەرداری ئـێمەدا حەزرەتی موحەممەد ﷺ کە عەبد و ڕەسوولی تۆیە، وە بەسەر حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیلدا و بەسەر تەواوی

ئەنبیا و ڕەسوولەکانت ﷺ ئەی خوای گەورە، ئا لەم شوێنەدا کە ئەووەڵین مەناسیکمە، داوات لێ ئەکەم و ڕجام لێتە کە تەوبەم لێ قەبووڵ بکەی و لە گوناهانم ببووری و داوات لێ ئەکەم کە هەموو گوناهەکانم لاببەی، حەمد و ستایش هەر لەبۆ ئەو خوایەیە کە منی گەیاندووە بە «بیت‌الحرام»ێکی وا کە زاتی حەق کردوویەتی بە جێگەی ئەمن و سەواب و موبارەکی کردووە و کردوویشیەتی بە هیدایەت و قیبلەی تەواوی بوونەوەر.

***

## ئەرکانی حەج و عومرە

حاجی، ئەرکانی حەج پێنجن، ئەگەر تەرتیب حیساب نەکەین؛ هەروەها ئەرکانی عومرەیش جگە لە وەستانی کێوی عەرەفات، کە ئەم پێنج دانە بریتین لە: (١ـ ئیحرام، (٢ـ وەستانی کێوی عەرەفات، (٣ـ تەوافی ماڵی خوا، (۴ـ ڕاکردن (سعی) مابەینی

سەفا و مەروە، (٥ـ تاشین یا کورت کردنەوەی مووی سەر.

حاجی، واجباتی حەج پێنجن: (١ـ ئیحرام لە میقاتدا، (٢ـ مانەوەی شەوی جەژن لە «مُزدَلِفه»دا، (٣ـ مانەوەی دوو شەو لە «مِنیٰ»دا، (٤ـ رەجمی شەیتان، (٥ـ دووری گرتن لە ئەنجامدانی ئەوانە کە لە دوای پۆشینی ئیحرام حەرامن.

خۆلاسە، ئەرکانی حەج پێنج بوون، بەڵام ئەرکانی عومرە چوارن: (١ـ ئیحرام، (٢ـ تەوافی ماڵی خوا، (٣ـ راکردن (سعی) مابەینی سەفا و مەروە، (٤ـ حەلق یا کورت کردنەوەی مووی سەر. ئیتر وەستانی کێوی عەرەفاتی نیە.

ئاگاداری! حاجی ئەبێ لە مینادا حەلقی سەر بکات؛ بەڵام عومرەگوزار ئەبێ لە مەروەدا حەلقی سەر بکات.

*- هەروەها واجباتی حەج پێنج بوون، بەڵام

واجــباتی عــومرە دوانــن: (١ـئـیحرام لە مـیقاتدا، (٢ـدووری گـرتن لە وانـەی دوای پـۆشینی ئـیحرام حەرامن. ئیتر «مَبیت» یانێ مانەوەی شەوی موزدەلیفە و ڕەجمی شەیتان و مانەوەی دوو شەوی مینای نیە.

***

فەرقی ڕۆكن و واجب

حاجی، فەرقی ڕوكن و واجب ئەوەیە: حەج بـەبێ ڕوكن سەحیح نییە و دانامەزرێ، تەنانەت بـە تـەركی یەك روكن حەجەكەت بەتاڵ ئەبێتەوە و بـە كـەفارەت جوبران نـاكـرێتەوە. بـەڵام بـە تـەركی واجب حـەج سەحیحە و دائەمەرزێ و بەتاڵ نابێتەوە، وە بەكەفارەت جوبران ئەكرێتەوە. حوكمی عومرەیش هەروایە؛

بزانە ئەو واجباتانە ئەگەر ئـەنجام نـەدرێن و بـە كەفارەت جوبران بكرێنەوە پێنج واجباتە: «١. ئیحرام لە میقاتدا، «٢. مانەوەی شەوی جەژن لە موزدەلیفەدا، «٣. رەجمی شەیتان، «٤. مانەوەی دوو شەو لە «مِنی»دا،

**«٥. «طواف‌الوداع» (تەوافی خواحافیزی و گەڕانەوە)**

**خولاسە، بە تەرکی هەریەك لەم پێنج واجباتە لەسەر حاجی واجب ئەبێ کە یەك سەر حەیوان سەر ببڕێ بۆ داماوانی حەرەمی مەککە.**

***

## حەج بە سێ جۆر ئەکرێ

حاجی، **حەج و عومرە بەم سێ جۆرە ئەنجام ئەدرێ: (١-«إفراد»، (٢-«تَمتُّع»، (٣-«قِران»، ئیفراد یانێ حاجی لە پێشا حەج بکا و دوایی عومرە. تەمەتتوع پێچەوانەی ئەوە، واتە لە پێشا عومرە بکا و دوایی حەج. قیڕانیش یانێ حاجی حەج و عومرە بەیەکەوە بکا. برای هۆشیارم، چوون لە «تمتّع و قِران»دا فیدیە هەیە و لە «افراد»دا فیدیە نیە، تۆ بە نیەتی ئیفرادەوە حەج بکە، نەك بە تەمەتتوع و قیڕان. حاجی، کاتێ بە قیڕان و تەمەتتوع فیدیە واجب ئەبێ کە خەڵکی مەککە و دەوروبەری مەککە نەبێ، ئەگەر خەڵکی**

ئەویٚ بوو ئەوە فیدیەی لەسەر نیە.

((فرع))، ئیحرام بە دیاری کراوی و بە دیاری نەکراویش دائەمەزریٚ، دیاری کراوی وەك ئەمە نیەت بیٚنی کە ئیحرام بە حەج ببەستی یان بە عومرە یا بە هەردووکیان. دیاری نەکراویش وەك ئەمە بلێی: نیەتم هەیە ئیحرام ئەبەسم بۆ خوای گەورە، ئیتر ناوی حەج یا عومرە نابا، بەڵام دیاری کراوی باشترە تا دیاری نەکراوی.

وە ئەگەر یەکێك وتی: وا ئیحرامم بەست وەك ئیحرامی مامۆستا، ئەوە ئیحرامەکەی وەك ئیحرامی مامۆستا دائەمەزریٚ، دیاریکراو بیٚ یا نە.

باسی نیەت هێنان

بزانە، سوننەتە بەر لە ئیحرام غوسڵ بکەی و نیەتی غوسڵی ئیحرامی لیٚ بیٚنی و بلێی: نیەتم هەیە غوسڵی سوننەتی ئیحرام ئەکەم و دوای سوننەتی غوسڵی ئیحرام، واجبە بە دڵ نیەتی ئیحرام بهێنی و بلێی:

«نیەتم هەیە قەسدی حەج ئەکەم و ئەچمە ناو ئیحرامی حەجەوە و ئیحرام بە حەج ئەبەستم بۆ خوای تەعالا». سوننەتیشە بە شوێنی نیەتا بڵێ «لبّيك اللّهمّ لبّيك، لبّيك لا شريك لك لبّيك، إنّ الحمد والنّعمة لك والملك، لا شريك لك» دوای تەلبیە کردنی زۆر سوننەتە سەڵواتی زۆر بۆ ڕۆحی ڕەسوولی خوا بنێری، و دوایی داوای ڕەزایەت و بەزەیی و بەهەشتی بەرین لە میری مەزن بکەی، هەروەها داوای ئەوەی لێ بکەی کە لە ئاوری جەهەنم بتپارێزێ و پاشان لە هەرچی حەز بکەی بۆ خۆت و بۆ هەرکەس کە خۆشت ئەوێ، لە خوا داوا بکەی.

«فرع» حاجی یا عومرەگوزار تا وا لە لیباسی ئیحرامدا لە هەموو حاڵەتێکدا سوننەتە تەلبیە بکا، کەیف خۆیەتی لە حاڵەتی ڕۆشتن و وێسانا یا دانیشتن و سواری و پیادە و ڕاکێشان و لەشگرانیشدا بێ، یا ژن و لە عادەتی شەرعیدا بێ، بەڵام سوننەتە پیاو بە دەنگی

بەرز تەلبیە بکا، ئەمما بۆ ژن کەراهەتی هەیە و نابێ دەنگ بەرز بکاتەوە. سوننەتە ئافرەت هەردوو دەستەکانی لەگەڵ جومگەکانیا بە خەنە ڕەنگ بکات با تا ها لە ئیحرامدا ڕەنگی خەنە پێستی دەستەکانی داپۆشێ، واجبە پیاو لە جلوبەرگی دووڕراو دووری بگرێ و ئەبێ بە حەولەیەك یا وەك حەولەیە کە مابەینی ناوك و ئەژنۆی داپۆشێ، بە خۆیەوە بپێچێ، وە بە حەولەیەکی تریش لای سەرەوەی پێ داپۆشێ، سوننەتە هەردوکیانیش سپیبن. ئەتوانێ لەسەر حەولەی خوارەوە قایش یا پەتێك بە خۆیەوە ببەستێت، یان بە دەرزی و دوگمە قایمی کات تاکوو ڕابوەستێ، بەڵام حەولە ژووروووەکە نابێ گرێی یا دەرزی لێبدا، نابێ قولاپ و دوگمەی لێبدرێ، بەڵام بۆ ئافرەت دروستە لیباسی دووڕراو و چنراو لەبەر بکات تەنها دەست و دەموچاوی نەبێ، واتە: نابێ دەستەوانە بکاتە دەستی و نیقاب بپۆشێ، بەڵام بۆی هەیە هەر جۆرە کەوش و

گۆرەوی بپۆشێ، ئەمما پیاو نابێ گۆرەوی و ئەو جۆرە پێڵاوانە بکاتە پێی کە پاژنەی پێ و سەرپەنجەکانی داپۆشێ، ئەبێ دوو نەعلی وا بکاتە پێی کە پاژنەو سەر پەنجەکانی پێی بە دەرەوە بێ.

بزانە! میقات دوو بەشە: ١. میقاتی زەمانی، ٢. میقاتی مەکانی. میقاتی زەمانی بۆ حەج سێ کاتە: (١. مانگی شەوال، (٢. مانگی «ذي القعدة»، (٣. دە شەوەی ئەووەڵی قوربان، بەلاّم بۆ عومرە تەواوی ساڵە. میقاتی مەکانی بۆ حەج یا بۆ عومرەیەك کە لە ئەییامی حەجدا نەبرێ بەڕێوە، ئەوە لە حەقی کەسێك‌دا کە خەڵکی مەککەبێ هەر نەفسی مەککەیە، بەلاّم بۆ غەیری خەڵکی مەککە بۆ حاجییەك یا بۆ عومرەگوزارێك کە لە مەدینەوە بێت «ذو الحليفة»یە کە ئێستا مەشهوورە بە «أبيار علي» و «مسجد الشجرة». وە بۆ ئەوانە کە لە «شام» و «مصر» و «مغرب»وە بێن «جحفة»یە. وە بۆ ئەوانە کە لە «تهامة اليمن»وە بێن،

«يلملم»ە. وە بۆ ئەوانە کە لە «نجد اليمن» و «نجد الحجاز»ەوە بێن «قرن»ە. وە بۆ ئەوانە کە لە «مشرق العراقي و غيره»وە دێن «ذات عرق»ە. وە بۆ ئەوانە کە لە ڕێگەیەکەوە بێن نەلکێ بە یەکێ لەو شەش میقاتەوە، ئەوە ئەگەر ئەو ڕێگە ڕوو بە ڕووی یەکێ لەو شەش میقاتانە بوو، ئەبێ لە ڕوو بە ڕووی ئەو میقاتەوە ئیحرام بپۆشن، ئەگەر لە بەینی دوانیان بوو هەر میقاتێکیان لە مەککەوە دوور بوو ئەوە لە ڕوو بە ڕووی ئەویانەوە ئیحرام بپۆشن. وە ئەگەر ڕێگەکەیان ڕوو بە ڕووی هیچ میقاتێك نەبوو، ئەوە ئەبێ دوو مەرحەلەی بمێنێ بۆ مەککە ئیحرام بپۆشن. وە بۆ ئەوانە کە مەسکەنیان لە بەینی میقات و مەککەدایە ئەوە میقاتیان هەر مەسکەنی خۆیانە.

بزانە، ئەگەر هەرکەسێك گەیشتە میقاتێکی شەرعی و لەو حاڵەتەدا نەیدەویست حەج یان عومرە بکا، ئینجا لەپاش تێپەڕ بوون دڵی گۆڕا و ویستی حەج یان

عومرە بکا، ئەوە شوێنی ئیحرام بەستنی ئەو شوێنەیە کە نیازی کردووە حەج یان عومرە جێبەجێ بکات.

رووناکی

ئەگەر کەسێك گەیشتە میقاتێك و ئەیویست حەج یان عومرە بکا، ئەوە بەبێ ئیحرام بەستن بۆی دروست نییە لە میقاتەکە تێپەڕێ. جا ئەگەر گوێی نەدا و لە میقاتەکە تێپەڕی کرد، ئەوە لەسەری واجبە پێش ئەوەی کە ئیحرام ببەستێ بگەڕێتەوە بۆ میقات تا ئیحرام بە حەج یان عومرە ببەستێ. بەڵام پێویست ناکات بۆ میقاتەکەی خۆی بگەڕێتەوە، بەڵکوو لازمە بە ئەندازەی میقاتەکەی بگەڕێتەوە شوێنێکی تر و لەوێ ئیحرام ببەستێ. ئەگەر کاتەکەی بەرتەنگ بێ و فریای حەج نەکەوێ، یان ڕێگاکە مەترسی هەبێ یان نەخۆش بێ، ئەوە لەو حاڵەتانەدا واجب نییە بگەڕێتەوە. جا ئەگەر نەگەڕایەوە و ئیحرامی بەست و چوو بۆ شاری مەککە، ئەوە لەسەری واجبە خوێنێك بدات.

وە ئەگەر لە میقاتەکە تێپەڕی و ئیحرامی بەست و ئینجا گەڕایەوە بۆ میقات، ئەوە بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەگەر پێش ئەوەی دەست بە کارێکی حەج یان عومرە بکا، بگەڕێتەوە بۆ میقات، ئەوە خوێنەکەی لەسەر نامێنێ؛ وە ئەگەر نەگەڕایەوە بۆ میقات، بەڵکوو دەستی کرد بە ڕوکنێك لە ئەرکانی حەج یان عومرە، یا سوننەتێك لە سوننەتەکانیان، ئەوە خوێنی لەسەر لاناچێ و ئەبێ بیدات.

وە ئەگەر کەسێك گەیشتە حەرەمی مەککە و نەیئەویست حەج یان عومرە بکا، بەڵام لەدوای تێپەڕ بوون دڵی گۆڕا و ئینجا ویستی عومرە جێبەجێ بکا، ئەوە لەسەری واجبە بڕواتە دەرەوەی حەرەمی مەککە و ئیحرام ببەستێ وەك: «تَنعیم، جَعرانە، حدیبیە»؛ وە ئەگەر ویستی وابوو حەج بکا، ئەوە لەسەری واجبە لە حەرەمی مەککەدا ئیحرام بە حەج ببەستێ.

بزانە، ئەگەر حاجی لەجیاتی مردوویەك یان

پەك كەوتوویەك حەج یا عومرەی كرد لە سەری واجبە كە ناوی ئەو كەسە بیات بۆ نموونە بڵێ: «نَوَيْتُ الْحَجَّ وَ أَحْرَمْتُ عَنْ زَيْدٍ لِلّٰهِ تَعَالىٰ» نیەتم هەیە لەباتی زەید حەج ئەكەم و ئیحرام بە حەج ئەبەستم بۆ خوای تەعالا، وە بۆ عومرەیش بڵێ: نیەتم هەیە لەباتی فڵانەكەس عومرە ئەكەم و ئیحرام بە عومرە ئەبەستم بۆ خوای گەورە.

بزانە! هەر پەككەوتوویەك كە بیەوێ كەسێك بە كرێ بگرێ تا حەج و عومرەی بۆ بكا یا كەسێ كەسێ بە كرێ بگرێ كە حەج و عومرە بۆ مردووی بكا، ئەوە لازمە هەردووكیان (بە كرێ گرەكەوبە كرێ گیراوەكە) تەواوی ئەركان و واجباتی حەج و عومرە بزانن، هەروەها ئەبێ بە كرێ گیراوەكە بە نەفسی خۆی تەواوی ئەركان و واجباتی حەج و عومرە ئەنجام بدات. دروست نییە بە دوو كەس واجبات و ئەركانی حەج یا واجبات و ئەركانی عومرە تەواو ببێ.

«فرع» ئەگەر یەك نەفەر لە یەك ساڵدا دوو نەفەری بە کرێ گرت تا حەجی بۆ بکەن، ئەوە هەردووکیان دروستن و دائەمەزرێن.

«فرع» ئەگەر کەسێ حەجی واجب و حەجی نەزری لەسەر بوو، ئەوە ئەبێ لە پێشا حەجی واجب ڕچاو بکا.

«فرع» سوننەتە حاجی کەیف خۆیەتی پیاو بێ یا ئافرەت یان نێرامۆك، موراعاتی نەزافەت و پاکی بکا، مەسەلەن نینۆك بکا و مووی ژێر باڵی هەڵکێشێ و مووی بەری بتاشێ و سمێڵی کورت بکاتەوە و وێنەی ئەمانە.

ئاگاداری ، لە حاڵەتی لەشگرانی و زەیسانی و حەیزدا ئیحرام بە حەج و عومرە دروستە و سەحیحە، هەر ئافرەتێ کە لە عادەتی شەرعی یا لە حاڵەتی زەیسانیدا بێ، بۆی سوننەتە غوسڵی ئیحرام بکا.

بزانە! ئەگەر حاجی ئیحرامی بە حەجی تەمەتتوع

بــەست و لەپــێش حــەجدا عــومرەی کــرد و پــاشان گەڕایەوە بۆ میقاتی مەکانی وەك «یلمَم» یا «جُحفه» یا «قرن» یا «ذوالحلیفه» یــا «ذات‌العــرق» لە یــەکــێ لەم شوێنانەدا ئیحرامی بە حەج بەستەوە ئــیتر لازم نــاکــا فیدیە بدات، وە ئەگەر نەگەڕایەوە ئەوە لەسەری واجبە کە فیدیە بدات.

## چونیەتی تەواف

بزانە. «طــواف» ســێ بــەشە، ســوننەت و ڕکــن و واجب، تەوافی سوننەت وەك «طواف‌القدوم»، تەوافی واجب وەك «طـــوافالوداع» تـــەوافـــی ســێهەم «طوافالرّکن»ە، حەج بەبێ تەوافی ڕوکن بەتاڵە،

فەرع! تەوافی قودووم تایبەتی کەسێکە کە ئیحرامی بە حەج یا بە حەج و عومرەی بەستبێ و بەر لە چوونی بۆ کێوی عەرەفات هاتبێتە ناو مەککەوە. جا ئــەگــەر ئیحرامیشی هەر بە عومرە بەستبێ ئەوە تەنیا تەوافــی ڕوکن ڕچاو ئەکا، ئیتر تەوافی قودوومی ناوێ. کە مادام

وایە عومرەگوزار دوو تەواف ئەنجام ئەدا: (یەك: تەوافی ڕوکن، (دوو: تەوافی خواحافیزی. ئیتر تەوافی قودوومی ناوێ.

جا بزانە، ئەگەر تەوافی خواحافیزی ڕچاو نەکرێ حەج و عومرە هەر دروستن، بەڵام خوێنی لەسەر واجب ئەبێ، ئیتر جیاوازی نییە لەما کە لە سەفەری حەجا بێ یا عومرە. وە ئەگەر لە یەك سەفەردا حەج و عومرەی کرد، ئینجا ویستی لە مەککە بڕواتە دەرەوە، ئەوە بۆ هەردووکیان یەك «طواف‌الوداع» بەسە.

## واجبەکانی تەواف

تەواف هەشت واجباتی هەیە و ئەبێ حاجی و عومرەگوزار ئەنجامیان بدەن:

(١ـ ئەبێ نیەتی تەواف بهێنێ، ئەگەر تەوافەکەی سەربەخۆ بێ وەك تەوافی نەزر و تەوافی سوننەت، بەڵام نیەت بۆ تەوافەکانی حەج و عومرە واجب نیە، چوون نیەتی حەج و عومرە شامیلی نیەتی تەوافیشە

وەك شامیلی نیەتی وقووف و غەیری وقووفیشە، بەڵام باشتر وایە کە نیەتی تەواف بێنێ.

(٢ـ پـاکـی لە بـێدەسنوێژی و لەشپیسی و نەجاسەت.

(٣ـ پۆشینی عەورەت. کە بۆ پیاو مابەینی ناوك و ئەژنۆیە، وە بۆ ئافرەت هەموو ئەعزایە جگە لە دەموچاوی.

(٤ـ لە بەرابەری ڕوکنی «حجرالأسود»ەوە دەستی پێ بکە و با تەواوی بەدەنت لە ڕابوردنا ڕووبەڕووی «حجرالأسود»ەوە بێ.

(٥ـ ماڵی خوا لە تەرەفی چەپەوە ڕا بگرە.

(٦ـ ئەبێ لەناو «مسجدالحرام»ەوە دەورەکان ئەنجام بدەی.

(٧ـ مەقسوودت بە سووڕانەوە بە دەوری ماڵی خوادا، تەنها تەواف بێ و بەشوێنی شتا نەگەڕی.

(٨ـ حەوت جار دەوری ماڵی خوا بدەیتەوە.

حاجی، ئەگەر بەسەر شازروانا بچی بەرێدا، یا دەست بدەی بە دیواری بەیتەوە کە وا لە ئاستی شازروانا، یا دەست لەسەر دیواری حیجری ئیسماعیل دابنێی یا لە دەرگایەکی حیجری ئیسماعیلەوە بچیتە ناوەوە و لەوی‌تریانەوە بڕۆیتە دەرەوە، ئەوە تەوافەکەت دروست نییە و بەتاڵە.

«فرع» ئەگەر لە غەیری «حجرالأسود»ەوە دەست بکەی بە تەواف ئەم دەورتە دروست نابێ. جا کاتێك گەیت بە حەجەر ئەوە لەوێوە ئەبێ بە سەرەتای تەواف، وە ئەگەر لە ناو تەوافدا بێ‌دەستنوێژ بووی، ئەبێ دەستنوێژ بگریتەوە، ئینجا لەسەر ئەوەی کردووتە دەست بکەرەوە بە تەواف، ئیتر لازم ناکا لە سەرەتاوە دەستی پێ بکەیتەوە. بۆ وێنە: ئەگەر لە دەوری چوارەمدا دەستنویژت شکا ئەوە بڕۆ دەستنوێژ بگرەوە و سێ جاری‌تر دەور بدەرەوە، وە ئەگەر لە هەر دەورێکا لیباست پیس بوو، یا عەورەتت کەوتە دەرەوە

ئەوە ئەو دەورتە بۆ حیساب نـاکـرێ و ئـینجا دوای لابردنی پیسییەکە و سەتری عەورەت دەست بکەرەوە بە تەواف و باقی دەورەکان ڕچاو بکە، ئیتر لازم ناکات بڕۆیتەوە ئەووەڵ، چوون مەرج نییە تـەواف بـەشوێن یەکتردا بێ.

«فرع» ئەگەر ئافرەتێك بە سەری ڕووتی یا بڕێ لە سەری ڕووت بێ یا یەك تاڵ مووی بەدەرەوە بێ، یـا قاچی یا بڕێ لە قاچی یا نینۆکی قاچی بەدەرەوە بێ، تەوافی کرد ئەوە تەوافەکەی بەتاڵـە و دانـامەزرێ، وە ئەگەر هەروا گەڕایەوە ئـەوە بـەبێ حـەج و عـومرەی دامەزراو گەڕاوەتەوە.

## سوننەتەکانی تەواف

**تەواف هەشت سوننەتی هەیە:**

**(١ـ بە پیادە تەواف بکەی.**

**(٢ـ لە ئـــــەووەڵی تـــەوافـــەکـــەوە ئـــیستیلامی «حجرالأسود» بەم شێوە بکەی: ئەگەر بۆت کرا سـەر بخەرە ناو «حجرالأسود»ەوە و ماچی بکە، ئەگەر بۆت نەکرا دەستی پێوە بدە، ئەگەر ئەمەیشت بۆ نەکرا هەر لە دوورەوە ئیشارەی بۆ بکە.**

**(٣ـلە ئەووەڵی تەوافەکەوە سوننەتە ئـەم دۆعـایە بخوێنی:** «بِسْمِ اللّٰهِ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُمَّ إِيمَاناً بِكَ وَ تَصْدِيقاً بِكِتَابِكَ وَ وَفَاءً بِعَهْدِكَ وَاتِّبَاعاً لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ مُـحَمَّدٍ ﷺ» **بەناوی خواوە تەواف ئەکەم، خواگەورەیە، ئەی خوای گەورە بڕوام بە تۆ هەیە و تەسدیقی کیتابی تۆ ئەکەم و وەفا بە عەهدت ئەکەم و پەیڕەوی لە ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەرەکەت ئەکەم.**

**❊ـ لە ڕووبەڕووی دەرگای بەیتەوە سـوننەتە ئـەم**

دۆعایە بخوێنی: «اللّٰهُمَّ إِنَّ الْبَيْتَ بَيْتُكَ وَالْحَرَمَ حَرَمُكَ وَالْأَمْنَ أَمْنُكَ وَ هٰذا مَقامُ الْعائِذِ بِكَ مِنَ النّارِ». ئەی خوای گەورە ئەم ماڵە ماڵی تۆیە، ئەم حەرەمە حەرەمی تۆیە، ئەمن ئەمنی تۆیە، ئێرە شوێنی ئەوەیە کە پەنابگرین بە تۆ لە ئاگری جەهەننەم.

※ـ لەلای مەقامی حەزرەتی ئیبراهیمدا سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنی: «اللّٰهُمَّ إِنَّ بَيْتَكَ عَظِيمٌ وَ وَجْهَكَ كَرِيمٌ وَ أَنْتَ أَرْحَمُ الرّاحِمِينَ فَأَعِذْني مِنَ النّارِ وَ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ وَ حَرِّمْ لَحْمي وَ دَمي عَلَى النّارِ وَ أَمِنّي مِنْ أَهْوالِ يَوْمِ الْقِيامَةِ وَاكْفِني مُؤنَةَ الدُّنْيا وَالْآخِرَةِ».
ئەی خوایا، بەڕاستی ماڵت گەورەیە، زاتت سەخی و لە هەموو کەس بە ڕەحم‌تری، ڕجام هەیە و داوات لێ ئەکەم کە لە ئاگری دۆزەخ و شەڕی شەیتان بمپارێزی و گۆشت و خوێنم بە ئاگری جەهەننەم نەسووتێنیٚ و لە ناڕەحەتی ڕۆژی قیامەت ئەمینم کەی، وە لە کۆسپەکانی دونیا و قیامەت بمپارێزی. پاشان بە زۆری

حەمد و سەنای خوا بكە تا ئەگەیتە ڕوكنی عـیراقـی.
لەلای ڕوكنی عیراقیدا سوننەتە ئەم دۆعایە بـخوێنی:
«اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشِّرْكِ وَالشَّكِّ وَالْكُفْرِ وَالنِّفَاقِ وَالشِّقَاقِ وَ سُوءِ الْأَخْلَاقِ وَ سُوءِ الْـمَنْظَرِ فِـي الْأَهْـلِ وَالْمَالِ وَالْوَلَدِ». ئەی خوایا، بەڕاستی هەر بە تۆ خۆم ئەپارێزم، لەوە كە شەریكت بۆ قەرار بدەم و لە كوفر و نیفاق و جـیاوازی و دوودڵـــی و ئـەخلاقی نـاڕەوا و خراپ و مەنزەرەی خراپ و نابار لە خێزان و مـاڵ و منداڵدا.

*ـكاتێ كە گەیشتیتە پلووسكی ڕەحمەت سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنی: «اللَّهُمَّ أَظِلَّنَا تَحْتَ عَرْشِكَ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّكَ، اللَّهُمَّ اسْقِنِي بِكَأْسِ مُحَمَّدٍ ﷺ شُـرْبَةً لَا أَظْمَأُ بَعْدَهَا أَبَداً». ئەی خوایا، ڕجام هەیە و داوات لێ ئەكەم كە بمانخەیتە ژێر سێبەری عەرشت لە ڕۆژێكا كە سێبەر نییە بێجگە سێبەری تۆ نەبێ، ئـەی خـوایـا داوات لێ ئەكەم بە پیاڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوم پێ

بدەی با هەتا هەتایە تینووم نەبێ.

❊ـ کاتێ گەیشتیتە ڕوکنی شامی سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنی: «اللّٰهُمَّ اجْعَلْهُ حَجّاً مَبْرُراً وَ سَعْياً مَشْكُوراً وَ ذَنْباً مَغْفُوراً وَ تِجٰارَةً لَنْ تَبُورَ يٰا عَزِيزُ يٰا غَفُورُ، رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَ تَجٰاوَزْ عَمّٰا تَعْلَمُ إِنَّكَ أَنْتَ الْأَعَزُّ الْأَكْرَمُ». ئەی خوایا، ڕجام هەیە و داوات لێ ئەکەم ئەم حەجەم لێ وەربگری و قەبووڵی بکەی، وە ئەم عەمەڵەم لێ وەرگری و لە گۆناهم خۆش ببی و بی‌گێڕە بە تیجارەتێکی نەبڕاوە «یا عزیز یا غفور» ئەی خوایە ڕجام هەیە کە لێم ببووری و ڕەحمم پێ‌بکەی و لە گوناهانم کە تۆ پێیان ئەزانی و من نازانم بمبەخشی، بەڕاستی ئەی خوا زۆر گەورە و بەڕێزی.

❊ـ کاتێ گەیشتی بە ڕوکنی «یَمانی» سوننەتە ئەم زیکرە بخوێنی: «اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْفَقْرِ وَ مِنْ عَذٰابِ الْقَبْرِ وَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيٰاءِ وَالْمَمٰاتِ وَ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِزْيِ فِي الدُّنْيٰا وَالْآخِرَةِ».

ئەی خوایا، بەڕاستی هەر بە تۆ خۆم ئەپارێزم لەکوفر و هەر بە تۆ خۆم ئەپارێزم لە هەژاری و عەزابی قەبر و لە فیتنەی ژیان و مردن، هەر بە تۆ خۆم ئەپارێزم لە ڕسوایی و ئابڕووچوونی دونیا و قیامەت.

*ـ کاتێ کەگەیشتی بە بەینی ڕوکنی یەمانی و «حجرالأسود» سوننەتە بڵێی: «اللّٰهُمَّ آتِنا فِي الدُّنْيا حَسَنَةً وَ فِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَ قِنا عَذابَ النّارِ». ئەی خوایا، ڕجام هەیە چاکەی دونیا و قیامەتمان پێ عەتا بکەی و لە عەزابی ئاگر بمانپارێزی. ئەمجار سوننەتە بۆ هەرچی مەیلت بێ لە خوای گەورە داوا بکەیت.

(۴ـلە سێ سووڕانەوەی ئەووەڵدا سوننەتە بە پەلە دەور بدەیتەوە و گورگەلۆقێ بکەی و ئەم دۆعایەش بخوێنی: «اللّٰهُمَّ اجْعَلْهُ حَجّاً مَبْرُوراً وَ ذَنْباً مَغْفُوراً وَ سَعْياً مَشْكُوراً». ئەی خوایا، ڕجام هەیە و داوات لێ ئەکەم ئەم حەجە بکەی بە تاعەت و گوناهی تێکەڵ نەکەی، وە لەگوناهەکانم ببووری و عەمەڵەکەم قەبووڵ

بکەی.

(٥ـ سونندتە «اضطباع» بکەی، واتە: ناوەڕاستی لیباسی ئیحرامەکە بخەرە ژێر باڵی ڕاست و هەردوو سەرەکەی بخەیتە سەر شانی چەپت و شانی ڕاستت بە رووتی بهێڵیتەوە.

(٦ـ لە نزیك بەیتەوە تەواف بکەیت.

(٧ـ بەشوێن یەکەوە تەوافەکان ئەنجام بدەیت. وەختێ هەر حەوت تەوافەکانت تەواو کرد سوننەتە بڕۆی بۆ «ملتزم»، مولتەزەم وا لەبەینی «حجرالأسود» و «باب‌الله» دا. بەباشی خۆت بلکێنە بە بەیتەوە و دەست بگرە بە پەردەی کەعبەوە و سکت بلکێنە بە ماڵی خواوە و کوڵمت بخەرە سەر دیواری بەیت و باوەشی پیاکە و بڵێ: «اللَّهُمَّ يَا رَبَّ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ أَعْتِقْ رَقَبَتِي مِنَ النَّارِ وَ أَعِذْنِي مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ وَ أَعِذْنِي مِنْ كُلِّ سُوءٍ وَ قَنِعْنِي بِمَا رَزَقْتَنِي وَ بَارِكْ لِي فِيمَا آتَيْتَنِي، اللَّهُمَّ إِنَّ هٰذَا الْبَيْتَ بَيْتُكَ والْعَبْدَ عَبْدُكَ وَ هٰذَا مَقَامُ الْعَائِذِ

بِكَ مِنَ النَّارِ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ أَكْرَمِ وَفْدِكَ عَـلَيْكَ».
ئەی خوایە، ئەی خاوەنی بەیتی ئازادکراو ڕجام هەیە و داوات لێ ئەکەم کە گەردنم لە ئـاگـری جـەهەننەم و شەیتانی ڕەجمکراو بپارێزی؛ ڕجام هەیە لە هـەرچـی خراپە هەیە مەحفووزم کـەی، هـیوام وایـە قـەناعەتم پـێ‌بکەی بـەوە کـە پـێم ئـەدەی و پـێم ئـەبەخشی؛ موبارەکی کەی لێم ئەوەی کە پێم ئەدەی. ئەی خوای گەورە ئەم ماڵە ماڵی تۆیە و منیش بەندەی تۆم و ئەم جێگە و مەقامیشە جێگەی ئەوەیە کـە داوای ئـەوەت لێ‌کەین بمانپارێزی لە ئاگری دۆزەخ، ئەی خـوایـا داوات لێ ئەکەم و ڕجا و ئارەزووم هەیە کە بمگێڕی و بمخەیتە ناو ئەو جەمع و کۆڕ و هۆزەوە کە بەلای تۆوە بـاش و بـەڕێزن، دوایـی حـەمدی خـوا زۆر بکـە و سەڵواتی زۆر لەسەر پێغەمبەری ئازیز بدە.

(٨ـلە دوای مەقامی حەزرەتی ئـیبراهـیمەوە دوو

ڕکات نوێژی سوننەت بکە و بڵێ: «نـیەتم هـەیە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی تەواف ئەکەم بۆ خوای تەعالا» لە ڕکاتی ئەووەڵدا سوورەتی ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بخوێنە، وە لە ڕکاتی دووهەمدا سوورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾. دوایی بڕۆ بـۆ حـوجرەی ئـیسماعیل لە ژێـر پلووسکی ڕەحمەتدا دوو ڕکات نوێژی سوننەت بکە، دوایی لە «مسجد الحرام»دا لە هەر شوێنێکی بێ دوو ڕکات نوێژی سـوننەت بـخوێنە، سـوننەتیشە ئـاوی زەمزەم بـخۆیتەوە و بـێ‌پرژێنی بـەسەر دەمـوچاو و سینەتدا. کاتێك ئاوی زەمزەم ئەخۆیتەوە سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنی: «اللّٰهُمَّ إِنّي أَسْأَلُكَ عِلْماً نٰافِعاً وَ رِزْقاً وٰاسِعاً وَ شِفٰاءً مِنْ كُلِّ دٰاءٍ». ئەی خـوایـە، بـەڕاسـتی داوای عیلم و زانستی بە سوود و ڕزقی حەڵاڵ و فراوان و شیفای هەموو نەخۆشینێکت لێ ئەکەم.

پوختەی قسە، سووڕانەوە بە دەوری ماڵی خـوادا

بەم تەرتیبەیە: ئەووەڵ لە ڕوکنی «حجرالأسود»ەوە کە لە خۆرهەڵاتی بەیتا قەراری گرتووە دەستی پێبکە، دوای ڕوکنی «حجرالأسود» مولتەزەمە، دوای مولتەزەم «بابالله»یە و دوای «بابالله» بەرابەری مەقامی حەزرەتی ئیبراهیمە، دوای ئەو ڕوکنی عێراقییە کە لە باکوور (شمال)ی بەیتایە، دوای ڕوکنی عێراقی حوجرەی ئیسماعیلە، پلووسکی ڕەحمەتیش لەوێیە، دوای حوجرەی ئیسماعیل ڕوکنی شامییە کە لە ڕۆژئاوای بەیتایە، دوای ڕوکنی «شامی» ڕوکنی یەمانییە، ڕوکنی یەمانی لە باشوور (جنوب)ی بەیتایە، دوای ڕوکنی یەمانی ڕوکنی حەجەرە. بەم شێوەیە یەك دەور تەواو ئەبێ، بەم جۆرە حەوت دەور تەواو بکەیت.

«فرع» برێك لە ئەسحابی موتەئەخخیرین، زانا و ئاگا و ئەهلی تەحقیق ئەو ڕەئییانە هەڵبژاردووە کە

عەفوو درابێ لەو پیس و چەپەڵییە کە لە دەوروبەری بەیتا لەناو «مسجدالحرام» و لە شوێنی تەوافدا هەیە و خەڵکی ناتوانن خۆیانی لێ بپارێزن، فەرموویانە: «إِذا ضاقَ الأَمْرُ، إتَّسَعَ».

***

## ئەو شوێنانە کە دوّعا تیایانا گیرا ئەبێ

بزانە، لە پانزدە شوێنی مەککەدا دوّعا وەرئەگیرێ و گیرایە: (١ـلە تەوافدا، (٢ـلە مولتەزەمدا، (٣ـلە ژێر پلووسکی ڕەحمەتدا، (٤ـلە ناو ماڵی خوادا، (٥ـلەلای ئاوی زەمزەمدا، (٦ـبەسەر کێوی سەفاوە، (٧ـبەسەر کێوی مەروەوە، (٨ـلە بەینی سەفا و مەروەدا، (٩ـلە پشتی مەقامی حەزرەتی ئیبراهیمەوە، (١٠ـلە کێوی عەرەفاتدا، (١١ـلە موزدەلیفەدا، (١٢ـلە «مِنیٰ»دا، (١٣ و ١٤ و ١٥ـلە کاتی ڕەجمی سێ جەمەرەدا.

## ئەو غوسلانەی كە لە حەجدا سوننەتن

بزانە، لە حەجدا نۆ غوسلّی سوننەت هەیە: (١ـبۆ ئیحرام پۆشین لە میقاتا، ئەڵێی: قەسدم هەیە غوسلّی ئیحرام ئەكەم، جا ئەگەر لەبەر نەخۆشی یان نەبوونی ئاو نەیتوانی خۆی بشوا، ئەوە سوننەتە لەباتی خۆشۆردن تەیەمموم بكا. (٢ـبۆ داخڵ بوونی مەككە لە زیتوا «ذی‌طوی»دا، (٣ـبۆ «طواف‌القدوم»، (٤ـبۆ وەستانی عەرەفە، (٥ـبۆ وەستانی «مُزدلِفه»، (٦و ٧و ٨ـبۆ سێ ڕەجمی شەیتان، بەڵام لە ڕۆژی جەژندا غوسلّ بۆ «جمرةالعقبة» نیە، (٩ـبۆ «طواف‌الوداع».

***

## ئەو شتانە كە لەسەر حاجی حەرامن

بزانە، ئەوانەی كە بۆ حاجی لەناو ئیحرامدا حەرامن، هەشتن: (١ـئەبێ تەواوی سەری یا بەعزێ لە

سەری بە هیچ شتێ دانەپۆشێ، دەس و دەمـووچاوی ژنیش وەك سـەری پیاو وایـە، نـابێ دایـان پـۆشێ. (٢ـ مەوادی بۆنخۆش بەكار نەهێنێ، بـەڵام ئـەگـەر دەس و دەمووچاو و سـەر بـە سـابوونی بـۆنخۆش بشۆرێ زیانی نیە. (٣ـنابێ مـووی هـیچ ئـەعزایـەك لابرێ، وە نابێ نینۆك بكرێ و نابێ سـەر و ڕیشـیش ڕۆناوی بكرێ. (٤ـ جیماع و موقەددیماتی جـیماع. (٥ـسەربڕینی حەیوانی كێوی. (٦ـ پـۆشینی لیـباسی دووراو. (٧ـنیكاح و تەزویج. (٨ـبڕینی دار و گـیای حەرەمی مەككە.

بزانە، ئەگەر حاجی لە ئیحراما جلی كردە بەر یـا خۆی بۆنخۆش كرد یا سەر و سمێڵ و ڕیشی چەور كرد، یا بە ئارەزووەوە نزیكی لە خێزانی كرد تا ئاوی هاتەوە، یا سێ تاڵ مووی ئەندامـی قـرتاند، یـا سـێ نینۆكی كرد، ئەوە لەسەری واجب ئەبێ حەیوانێك كە

بۆ قوربانی بشێ سەر ببڕێ و بیدا بە فوقەرای حەرەم، یا سێ ساع گەنم بدا بە شەش داماوی حەرەم، هەریەکێکیان نیو ساع، یا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ، وە بۆ بڕینی یەك تاڵ موو یا یەك نینۆك ئەبێ یەکسەد و بیست و یەك (١٢١) مسقاڵ، قووت یا یەك دیرهەم بدات بە فوقەرای حەرەم، یا یەك ڕۆژ بەڕۆژوو بێ. وە بۆ قرتاندنی دوو تاڵ موو یا دوو نینۆك دووسەد و چل و دوو (٢٤٢) مسقاڵ قووت یا دوو دیرهەم بدات یا دوو ڕۆژ بەڕۆژوو بێ. وە ئەگەر جیماعی کرد ـ حەڵاڵ بێ یاحەرام ـ هەرچەند حەج و عومرەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، ئەبێ ئەرکان و واجباتی باقیماندەی تەواو بکات. بێ تەفرە و دواخستن عومرە ئەنجام بدا. لە ساڵی داهاتوویشدا ئەبێ حەج بکاتەوە، هەرچەند سوننەتیش بێ، عەلاوە، ئەبێ کەفارەتیش بەم تەرتیبە بدا: یا ئەبێ وشترێك سەربڕێ بۆ هەژارانی

حەرەمی مەککە، یا گایەك یا حەوت سەر مەڕو بـزن، ئەگەر ئەوەی بۆ نەکرا ئەبێ بە قیمەتی وشترێك قووت بکڕێ و بیدا بە داماوانی حەرەمی مـەککـە، ئـەگـەر ئەوەیشی بۆ نەکرا لەباتی هـەر سـەد و بـیست و یـەك مسقاڵ قووت ئەبێ ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت. بەڵام کاتێك حەج و عومرە بەتاڵ ئەکاتەوە کـە بـەر لە «تـحلّل»ی ئەووەڵ بووبێ، وەگەرنە دوای تەحەللولی ئەووەڵ هەر فیدیەی لەسەر واجب ئەبێ و حەج عومرەکەی بەتاڵ ناکاتەوە. وە بۆ بڕینی داری گەورە ئەبێ گایەك بدا، وە تۆڵەی بڕینی داری بچووك مەڕێکە و تۆڵەی بڕینی گیا قیمەتیەتی.

بزانە، ئەو حەیوانە کە بەهۆی یەکێ لەم سێ شتەوە سەربڕینی واجب ئەبێ بریتین لە: (یەکەم: لەسەر ئەو کەسەی کە بە «تمتّع» یا «قِران» حەج بکا، (دووهەم: بە سەبەبی نەکردنی شـتێکی واجـبەوەیە، (سـێهەم: بـە

سەبەبی كردنی شتێكی حەرامەوە. ئەگەر بۆ حاجییەك كە بە تەمەتتوع یا قیڕان حەجی كرد و بۆی ڕێنەكەوت حەیوان سەر ببڕێ، ئەبێ دە ڕۆژ بەڕۆژوو بێ و سێ ڕۆژیان بەرلە تەواو بوونی حەج و حەوت ڕۆژی تریان پاش لە گەڕانەوەی بۆ ناو ماڵ و منالّی.

تۆڵەی حەیوانی كێوی بۆ «وشترمورغ» وشترە و بۆ گاكێوی و كەرەكێوی گایە، وە بۆ ئاسك، بزن و بۆ كەروێشك، گێسك و بۆ ڕزق (بەوەرز) كارژەلەیە. جا ئەو حەیوانە كە لە شەرعا تۆڵەی دیاری نەكراوە ئەوە دوو كەسی عاقڵ قیمەتی دیاری ئەكەن، ئەگەر وێنەی نەبوو بە قیمەتەكەی خواردەمەنی بسێنن و بیدەن بە داماوانی حەرەم. خوڵاسە ئەو شتانەی كە بۆ كەفارەت ئەشێن بریتین لە: وشتر و گا و مەڕ و بزن و گێسك و كارەژەلە و بەرخ یا بە قیمەتەكەیان قووتێكی وا بكڕیێ كە بۆ سەرفیترە بشێ و بدرێ بە داماوانی حەرەمی

مەککە، کەیف خۆیەتی گەدا و هەژارەکان نیشتەجێی حەرەم بن، یا ڕێبوار بن، پێویستە گۆشتی حەیوانەکە لانی کەم بدرێتە سێ هەژار، یان نابێ خۆی هیچی لێ بخوا. یا لەباتی هەر یەکسەد و بیست و یەك (١٢١) مسقاڵ قووت ئەبێ یەك ڕۆژ بەڕۆژوو بێ.

فائدة ، لە مەزهەبی ئیمامی حەنەفیدا گۆشتی خوێنەکان دروستە بنێررێ بۆ گەدا و هەژارانی وڵاتانی تر، بەڵام ئەبێ هەر لە حەرەمدا حەیوانەکان سەر ببڕێن.

«فرع» هیچ شتێ لە موحەڕڕەماتی ئیحرام حەج و عومرەی ژن و پیاو بەتاڵ ناکاتەوە غەیری جیماع نەبێ.

## بردنی بەرد و خاکی حەرەم

بزانە بردنی بەرد و خاکی حەرەمەین و ئەوەیش کە دروست ئەکرێ لە گڵی حەرەمەین، وەك گۆزە و شتانی تر بۆ غەیری حەرەمەین حەرامە و دروست نیە،

جا ئەگەر حاجی یا غەیری حاجی بە عینوانی تەبەڕڕوك، یا بە یاسای تیجارەت و بازرگانی بۆ غەیری حەرەمەین نەقڵی کرد، لەسەری واجبە ئەو شتە بگەڕێنێتەوە بۆ حەرەمەین.

با خوشکان بزانن، بۆ بەرگری لە عادەتی شەرعی ئەتوانن لە دەرزی و حەب ئیستیفادە بکەن تا ئاداب و ئەحکامی حەج و عومرە تەواو ئەبێ. ئەگەر ئافرەت بەر لە «طواف الإفاضة» کەوتە حەیزەوە و پاك نەبوەوە تا گەڕایەوە ئەوە هەر لە حاڵەتی ئیحرامدا ئەمێنێتەوە با چەن ساڵیش توول بکێشێ، تا بڕواتەوە بۆ مەککە و «طواف الإفاضة» بەجێبێنێ، بەڵام ئەگەر لە بەر نەبوونی نەیتوانی بڕواتەوە بۆ «بیت الحرام» ئەوە حوکم و بڕیاری «مُحصَّر»ی هەیە ئەتوانێ بەم سێ شەرتە تەحەللول بکات:

١. بە سەر بڕینی مەڕێك،

٢. بە قەسر، واتە کورت کردنەوەی مووی سەر،

٣. بە نیەتی تەحەللول. ئەمە وتەی بڕێکە لە موتەئەخخیرین، بەلاّم بڕێکی تریش فەرموویانە: ئەتوانێ تەقلیدی ئیمامی ئەبووحەنیفە و ئیمامی ئەحمەد بکا و بە عەجەلە واریدی «مسجدالحرام» ببێت و تەواف بکات و دوای تەواف لە «مسجدالحرام»دا نەوێسێ و بە سیرعت بێتە دەرەوە، بەلاّم ئەبێ لە کەفارەتا وشترێك بدا بە فوقەرای مەککە، ئیتر لە باتی «طواف الإفاضة» بۆی حیساب ئەکرێ.

ئاگاداری: جوان وایە پیاو و ژن تەقلیدی ئیمامی ئەبوحەنیفە ﷬ بکەن تا دەسنوێژیان لە یەکتر نەشکێ. بەلاّم ئەبێ موراعاتی مەزهەبی ئیمام ئەبوحەنیفە بکەن تا «تلفیق» ڕوو نەدا؛

بزانە! بەلای ئیمامی حەنەفییەوە فەرزی دەسنوێژ چوارن: (١ـشۆرینی دەمووچاو بە ئاوی پاك یەکجار، (٢ـشۆرینی هەردوو دەست تا ئەنیشك،

(٣ـ یەك‌چوارەمی مەسحی سەر، (٤ـشۆرینی هەردوو پێ لەگەڵ هەردوو قولەپێ‌دا.

ئەو شتانە كە دەسنوێژ بەتاڵ ئەكەنەوە نۆ شتن:

(١ـ دەرهاتنی هەرشتێك لە پێش یا لە پاشەوە.

(٢ـدەرهاتنی خوێن یا كیم لە هەر شوێنیكی بەدەنا مادام لە شوێنی خۆیانەوە تەجاوەز بكەن و بڵاو ببنەوە.

(٣ـهاتنەدەرەوەی خوێن لە دەمەوە مادامێك زۆرتر بێ لە تفی ناو دەم یا بەرابەر بن.

(٤ـبە ڕشانەوەی هەرشتێك، بەڵام بەو شەرتە كە ڕشانەوەكە پڕی دەمی بێ.

(٥ـخەوتن، مادامێك ژێری خۆی مەحكەم نەكردبی.

(٦ـبێ‌هۆش بوون.

(٧ـشێت بوون.

(٨ـسەرخۆش بوون.

(٩ـ پێكەنین لەناو نوێژا بۆ ژن و پیاوی باڵغ، بەڵام

دەس دان بە عەورەتەوە دەسنوێژ نـاشكێنێ، لەمسـی پیاو بۆ ژن و ژن بۆ پیاو دەسنوێژ ناشكێنێ.

ئاگاداری! با خوشكان بزانن ژنێ كـە لە عـادەتی شەرعیدا بێ ئەتوانێ تەواوی مەناسیكی حەج و عومرە وەك نیەتی ئیحرام و سەفا و مەروە و ڕاوەستانی كێوی عەرەفات و حەلقی سەر و مانەوەی شەو لە موزدەلیفە و ڕەجمی شەیتان و مـانەوەی دوو شـەو لە مـینادا بـبا بـەڕێوە غـەیری تـەواف نـەبێ. وە بـۆ ئـەنجام دانـی تەوافیش ئـەتوانـێ تـەقلیدی ئـیمامی ئـەبوحەنیفە و ئیمامی ئەحمەد بكا و هجووم ببا و بە عەجەلە واریدی «مسجدالحرام» بـبێ و تـەواف بكـا. ئـەمما ئـەبێ لە كەفارەتیا وشترێك بدا بە فوقەرای مەككە، ئیتر لە باتی «طوافالافاضە» بۆی حیساب ئەكرێ وەك وترا.

***

## سەعی بەینی سەفا و مەروە

ئەوکەسەی کە تەوافی کرد، دوای تـەواوی بـوونی تەواف و دوو ڕکاتە نـوێژەکـەی، سـوننەتە دەست لە «حجرالأسود» بدا، ئینجا لە دەرگای سەفاوە بـڕواتـە دەرەوە بۆ سەعی مابەینی سەفا و مەروە.

جا بزانە، سەعی مابەینی سەفا و مەروە سێ شەرتی هەیە: (١ـ ئەبێ لە کـێوی سـەفاوە دەسـتی پـێ‌بکرێ. (٢ـ ئـەبێ حـەوت هـاتوچۆ بـێ. (٣ـ ئـەبێ لە دوای تەوافی ڕوکن یا دوای «طواف‌القدوم»ەوە بێت، بـەڵام چاك وایە لە دوای «طواف‌القدوم»ەوە بێت، سـوننەتە بەسەر کێوی سەفا و مەرووەوە بە قـەدەر بـاڵا پـیاوێك سەرکەوێ تا چاوی بە بەیت بکـەوێ، بـەسەر کـێوی «صفا و مَروه»وە سوننەتە ئەم دۆعا بخوێنێ: «اللّٰهُ أَكْبَرُ، اللّٰهُ أَكْبَرُ، اللّٰهُ أَكْبَرُ وَ لِلّٰهِ الْحَمْدِ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ عَلىٰ مٰا هَدٰانٰا وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ عَلىٰ مٰا أَوْلاٰنٰا لاٰ إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لاٰ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَ يُمِيتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَ هُوَ

عَلىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ وَ نَصَرَ عَبْدَهُ وَ هَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ لا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَ لا نَعْبُدُ إِلَّا إِيَّاهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَ لَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ». خوا لە هەموو شتێ گەورەترە، خوا گەورەیە، خـوا گـەورەیە، حەمد و ستایش هەر بۆ خوای گەورەیە کە هیدایـەتی ئێمەی دا و بە سەبەبی ئـیسلامەوە شـارەزای کـردین لەسەر تاعەتی، هەر بۆ خوا حەمد ئەکەین لەسەر ئەو نـــازونیعمەتانەی کـــە بـــە ئـــێمەی داوە، هـــیچ خوایەك عیبادەتی بۆ بکرێ بە حەق بـێجگە زاتـی الله نەبێ کە تەنیا و بێ‌شەریکە و هاوەڵی نیە، تەواوی ئەرز و ئاسمان موڵکی ئەوە، هەر بۆ ئەو حەمد و سـتایش ئەکرێ، هەر ئەو زیندوو ئەکاتەوە و ئەمرێنێ، تەواوی خێر بەدەستی ئەوە و قادرە بەسەر تەواوی مومکیناتا، هیچ خوایەك نییە عـیبادەت و پـەرستشی بـۆ بکـرێ بێجگە زاتـی ئـەو نـەبێ، تـەنیایە و وەعـدەی خـۆی جێبەجێ ئەکات، یاری و کـۆمەکـی بـەندەی خـۆی

ئــەدات، بــە تــەنیایی ئــەحزاب ئــەشکێنێ، هیچ خوایەك‌عیبادەت و پەرستشی بۆ بکرێ بێـجگە زاتـی ئەو نەبێ، ئێمەیش عیبادەت ناکەین بێجگە بۆ زاتی ئەو نەبێ، هەر موخلیسی ئـەوین و دیـن هـەر بـۆ ئـەوە، هەرچەند گرۆی کافرین و موناقیقینیش پێیان ناخۆش بێ.

لە ئەووەڵ و ئاخری سەفا و مەروەدا سـوننەتە بـە عادی بڕوا بەڕێدا و سوننەتیشە ئەم زیکرە بـخوێنی: «رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَ تَجَاوَزْ عَمَّا تَعْلَمُ إِنَّكَ أَنْتَ الْأَعَزُّ الْأَكْرَمُ، اللّٰهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَ فِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَ قِنَا عَذَابَ النَّارِ». ئەی خوایا داوای لێ خۆش‌بوون و بەزەییت لێ ئەکەم و ڕجا و ئـاواتـم ئـەمەیە کـە لێـم ببووری لەوەی کە ئەیزانـی، بـەڕاسـتی تـۆ گـەورە و بەڕێزی، ئەی خوایا چاکەی دونـیا و قـیامەتمان پـێ بیەخشی و لە عەزابی ئاگر بمان‌پارێزی.

بزانە، سوننەتە لە سەعی سەفا و مەروەدا «اضطباع»

بکەی و شەش «ذِراع»ی[1] بمێنێ بۆ میلە سەوزەکە گورگەلۆقێ بکەیت تا ئەگەیت بە میلە سەوزەکە وا لە جیهەتی مەروەوە، هەروەها لە مەرووەوە کە گەڕایتەوە با شەش زیراعی بمێنێ بۆ میلە سەوزەکە دەست بکە بە ڕاکردن تا ئەگەیتەوە بە میلە سەوزەکە وا لە تەرەفی سەفاوە. بەڵام ڕاکردن بۆ ئافرەتان سوننەت نییە.

لە سەفاوە بۆ مەروە بە ڕایەك حیساب ئەکرێ و لە مەروەیشەوە بۆ سەفا بە ڕایەکی تر، لە سەفاوە دەستی پێ ئەکرێ و لە مەرووەوە ئاخری دێت. جا ئەگەر کەسێك لە دوای «طواف‌القدوم»ەوە سەعی کردبێ ئیتر ئیعادەی گەرەك نیە. حاجی تا وا لە لیباسی ئیحرامدا و بەرەو ژوور و بەرەو خوار کە ئەکا یا ئەچێتە ناو ڕەفێقانەوە سوننەتە بە دەنگی بەرز تەلبیە بکات. بزانە،

(١) ذراع: نیو میتر.

فصل

بۆ پێشەوای موسوڵمانان یا جێنشینی سوننەتە لە ڕۆژی حەوتەمی مانگی «ذیالحجه» لەدوای نوێژی نیوەڕۆ لە شاری مەککەدا وتارێك بخوێنێتەوە و لە وتارەكەیدا حاجییان فێری ئەحكامی حەج بكا و فەرمانیان پێ بدا كە لە ڕۆژی هەشتەمی «ذیالحجه» بڕۆن بۆ «مِنیٰ»، جا لە ڕۆژی هەشتەمی «ذيالحجه»دا كە مەشهوورە بە «یومالتّرویه»، لەگەڵ حاجییانا بچێ بۆ مینا و شەوی عەرەفە لەوێ بن و كاتێ ڕۆژ بووەوە بڕۆن بۆ كێوی عەرەفات و لە ڕێگەدا سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنن: «اللّٰهُمَّ إِلَیْكَ تَوَجَّهْتُ وَ إِلیٰ وَجْهِكَ الْكَرِیمِ أَرَدْتُ فَاجْعَلْ ذَنْبي مَغْفُوراً وَ حَجّي مَبْرُوراً وَارْحَمْني وَ لا تُخَیِّبْني إِنَّكَ عَلیٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِیرٍ». ئەی خوای گەورە، ئەوا بۆ خزمەتی تۆ هاتم ئیرادەی زاتی گەورەیی تۆ ئەكەم، هیوا و ئارەزوو و ئاواتم ئەمەیە كە لێم خۆشبی و حەجم لێ وەربگری و ڕەحمم

پێبکەی و ئابڕووم نەبەی و بمپارێزی، بەڕاستی بەسەر هەموو شتێکدا تەوانایی و دەسەڵاتت هەیە.
سوننەتیشە لە ڕۆژی عەرەفەدا کەس واریدی کێوی عەرەفات نەبێ تا ڕۆژ لە خەتی ئیستیوا لا نەدات، بەڵکوو لە نزیکی مزگەوتی نەمیرەدا خێمەی خۆی هەڵبدا و بڕوا لە مزگەوتی حەزرەتی ئیبراهیمدا نوێژی نیوەڕۆ بکا، جا ئەگەر قەسر و جەمعی بۆ دروست بێ «جمع التّقديم» بکاو ئەمجار واریدی کێوی عەرەفات ببێ.

***

## دۆعای عەرەفات

*_کاتێك کەگەیشتیەکێوی عەرەفات سوننەتە ئەم دۆعایە بە زۆری بخوێنی: «لَا إِلٰـهَ إِلَّا اللّٰـهُ وَحْـدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَ لَهُ الْحَمْدُ وَ هُوَ عَلىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٍ، اللّٰهُمَّ اجْعَلْ في قَلْبي نُوراً وَ في سَمْعي نُوراً وَ في بَصَري نُوراً اللّٰهُمَّ اشْرَحْ لي صَدْري وَ يَسِّرْ لي أَمْري،

رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنْيا حَسَنَةً وَ فِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَ قِنا عَذابَ النّارِ، اللّٰهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسي ظُلْماً كَثِيراً وَ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلّا أَنْتَ فَاغْفِرْ لي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْني إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، اللّٰهُمَّ انْقُلْني مِنْ ذَلِّ الْمَعْصِيَّةِ إِلىٰ عِزِّ الطّاعَةِ وَاكْفِني بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ وَاغْنِني بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِواكَ وَ نَوِّرْ قَلْبي وَ قَبْري وَاهْدِيني وَ أَعِذْني مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ وَاجْمَعْ لِيَ الْخَيْرَ، اللّٰهُمَّ إِنّي أَسْأَلُكَ الْهُدىٰ وَالتُّقىٰ وَالْعَفافَ وَالغِنىٰ، اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِلْحاجِّ وَ لِمَنِ اسْتَغْفَرَ لَهُ الْحاجُّ». هیچ خوایەكعیبادەتی بۆ بکرێ بە حەق بێجگە زاتی الله نەبێ، زاتی الله تەنیایە و هاوەڵ و شەریکی نیە، موڵك و ستایش هەر هی ئەوە، بەسەر هەموو شتێکا تەوانایە، ئەی خوایا، ڕجا و ئاوات و ئارەزووم ئەمەیە کە نوور بخەیتە ناو دڵ و گوێچکە و چاومەوە، ئەی خوایا، هیوا و ئاواتم ئەمەیە کە دڵ و دەروون و سینەم بە نووری مەعریفەت شەرح و گوشاد و بڵاو کەیتەوە، کارەکانم بۆ سەهل و ئاسان

کەی، ئـەی خـوایـە، لە دونـیا و قـیامەتا چـاکـەمان پێبەخشی و لە عەزابی جەهەننەم بمانپارێزی، ئەی خوایا، زوڵمی زۆرم لە نەفسی خۆم کردووە، کەسیش ناتوانێ لە گوناهم خۆش بێ بێجگە زاتی تـۆ نـەبێ، ڕجا و هیوا و ئاواتم هەر ئەوەیە کە لێم خۆش بـبێ و لێخۆشبوون هەر لای تۆوەیە، داوات لێ ئەکەم کـە ڕەحمم پێبکەی و بەزەییت بە منا بێتەوە، بەڕاستی تۆ غەفوور و ڕەحیمی، ئەی خوایە، ڕجاو ئـاوتم لە تـۆ ئەمەیە کە لەناو زیللەتی گوناها دەرم بـێنی و داخـڵی عەزەمەتی تـاعەتم بکـەی و بـمخەرە نـاو گـەورەیی تاعەتەوە، داوات لێ ئەکەم، ڕجات لێ ئەکەم، هیوا و ئارەزووم لەتۆ ئەمەیە بە حەڵاڵ بێنیازم کەی لە حەرام، ڕجام هەیە بە فەیز و لوتفی خـۆت بـێنیازم کـەی لە غەیری خۆت، یاڕەببی داوات لێ ئەکەم دڵ و قـەبرم نوورانی کەی، یاڕەببی ئارەزووم ئەوەیە کە هیدایەت و ڕێنوێنیم بکەی، لە هەرچـی شـەڕە بـمپارێزی، ئـەی

خوایە، داوات لێ ئەکەم تەواوی چاکە و خەیرم بۆ کۆ بکەیتەوە، یاڕەببی داوای هیدایەت و تەقوا و لە خـوا ترسان و پاكداوێـنی و سـەروەتت لێ ئـەکـەم، ئـەی خوایا، ڕجام هەیە کە خۆش ببی لە حاجی و لەوەیش کە حاجی داوای لێخۆشبوونی بـۆ ئـەکـات. دوای خوێندنی ئەم دۆعا سـوننەتە سـەڵواتـی زۆر لەسـەر پێغەمبەری ئازیز ﷺ بدەیت و بۆ هەرچی مەیلت هەیە دۆعای‌تریش بکەی و لە دۆعـاکـانیشتا دەست بـەرز بکەیتەوە و هەزار کەڕەتیش سوورەتی ﴿قُلْ هُـوَ اللَّـهُ أَحَدٌ﴾ بـخوێنی، پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: «هەرکەس لە ڕۆژی عەرەفەدا هەزار مەرتەبە سوورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ﴾ بخوێنێ، هەرچی لە خـوا داوا بکـات پێی ئەدرێ».

حاجی بزانە،گەورەترین شوێن بۆ دۆعـا کـردن لە کێوی عەرەفاتا ئەو شوێنەیە کە پێغەمبەری ئـازیز ﷺ عیبادەت و زیکری تیا کردووە، ئەو شوێـنیشە بریتییە

لەو بەردە گەورانــە كــە لە خــواری «جــبل الرّحــمة»وە فەرش كراون، وان لە نــاوەڕاســتی كــێوی عــەرەفاتا و پێشی ئەڵێن «ایلال».

بزانە! تەواوی ئەرزی عەرەفات شوێنی ڕاوەستانە، جا ئەگەر حاجی لە ڕۆژی نــۆهەمی «ذي الحــجة»دا دوای لادانی ڕۆژ لە خەتی «استواء» لە هەر شوێنێكی ئەرزی عــەرەفاتدا ڕاوەســتێ هــەرچــەند بــە شــوێنی شتێكدا بگەڕێ مادامێك لە لیباسی ئیحرامدا بێ، ئەوە ڕاوەســـتانەكـــەی دروســـتە و ئـەبێ بـە حـاجی. وە فـەرموودەی ڕاست ئـەوەیە كـاتی وەسـتانەكـەیشی ئەمێنێ تا بەیانی ڕۆژی جەژنی قوربان، جـا ئـەگـەر حاجی لە عەرەفاتدا لە ڕۆژی نۆهەمدا ڕاوەستا ئەمجار پێش ڕۆژئاوا بـوون لە عــەرەفاتدا ڕۆیشــتە دەرەوە و نەگەڕاوە بۆ عەرەفات، ئەوە حەجەكەی دروست ئەبێ، ئـــەمما ســـوننەتە حـــەیوانـــێك ســـەرببڕێ، وە لە

فەرموودەیەكدا واجبە. جا لەكاتێكا ڕۆژ ئاوا بوو بڕۆ بۆ موزدەلیفە و نوێژی مەغریب ببە بۆلای عیشا و بە «جمع التّأخير» لە موزدەلیفەدا بیانخوێنە، بەڵام بەو شەرتە چوار ڕۆژ بەر لە ڕۆژی عەرەفە داخڵی مەككە نەبووبی، ئەگەر وابوو ئەبێ نوێژی مەغریب لە عەرافاتدا بكەیت و نوێژی عیشایش لە موزدەلیفەدا بەبێ قەسروجەمع.

ئاگاداری ، ئەگەر حەججاج لە ڕۆژی دەهەمی قوربانا بە هەڵە و ئیشتیبا لە عەرزی عەرەفاتا ڕاوەستان، ئەوە ڕاوەستانەكەیان كافییە، مەگەر لە عادەتی ساڵانی پێشوو ژمارەیان كەمتر بێ، ئەوە ئەبێ لە ساڵی داهاتوودا قەزای كەنەوە، بەڵام ئەگەر لە ڕۆژی هەشتەمدا بە ئیشتیبا ڕاوەستان و بەر لە وقووفی عەرەفە بۆیان دەركەوت كە بە غەڵەت ڕاوەستاون، ئەوە لەسەریان واجبە كە لە ڕۆژی نۆهەمیشدا لە عەرەفاتدا

بمێننەوە، وە ئەگەر بە هەڵەکەیان نەزانی تا ڕۆژی جەژن ئـــەوە لەســـەریان واجــبە کــە لە ســاڵی داهــاتوودا حەجەکەیان قەزا بکەنەوە.

***

## مانەوە لە موزدەلیفە

*ـکاتێك واریدی موزدەلیفە بوو یت سونnەتە ئەم دوّعایە بخوێنی: «اللّٰهُمَّ إِنَّ هٰذِهِ مُزْدَلِفَةٌ جُـمِعَتْ فـيهٰا أَلْسِنَةٌ مُخْتَلِفَةٌ تَسْأَلُكَ حَوٰائِجَ مُـؤْتَنِقَةً فَـاجْعَلْني مِـمَّنْ دَعٰاكَ فَاسْتَجَبْتَ لَهُ وَ تَوَكَّلَ عَلَيْكَ فَكَفَّيْتَهُ».ئەی خوایا، بەڕاستی ئەمە موزدەلیفەیە، تێـیدا کۆکراوەتەوە زمانی جۆراوجۆر (عەرەبی و غەیری عەرەبی)، یەکە یەکـە داوای ئارەزووی خۆیان لە تۆ ئەکەن، هیوا و ئارەزوو و ئاواتم ئەوەیە کە بمخەیتە ناو زومرەی ئەوکەسانەوە کە داوات لێ ئەکەن و ئارەزوویان جێـبەجێ ئەکـەیت و دۆعایان لێ وەرئەگری، پشتیان بە تۆوە بەستووە و تۆ بۆ ئەوان کافی و بەسی.

حاجی واجبە شەو لە موزدەلیفەدا بمێنێتەوە. بزانە، واجبەکەی بە مانەوەی کەمێ لە نیوەی دووەمی شەوی جەژنا دێتە جێ، جا ئەگەر ئەندازەیەك لە دوای نیوەشەو لەوێ مایتەوە و ئەمڕا ڕۆیشتی بۆ مینا یا لە پێش نیوەشەو ڕۆیشتی و بەڵام گەڕایتەوە بۆ موزدەلیفە، ئەوە لازم ناکا خوێن بدەی، وە ئەگەر نەگەڕایتەوە ئەوە ئەبێ حەیوانێك سەر ببڕی. بەڵام ئەگەر عوزرێکی شەرعی وەك ئەوەکە نەخۆش بی، یان پەلەت کردبێ و ڕێگەت لێ ون بووبێ و فریای موزدەلیفە نەکەوتبی، ئەوە خوێنت لەسەر واجب نابێ.

وە سوننەتە حەفتا دنکە بەردی چکۆلە بە قەدەر باقلە بۆ ڕەجمی شەیتان لە موزدەلیفەدا هەڵ بگری و نوێژی بەیانی زوو بکەی و بەرەو مینا بکەویتە ڕێ. کاتێك گەیشتیتە «مشعرالحرام» سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنی: «اللّٰهُمَّ بِحَقِّ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَالْبَيْتِ الْحَرَامِ وَالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالرُّكْنِ وَالْمَقَامِ أَبْلِغْ رُوحَ مُحَمَّدٍ ﷺ مِنَّا

التَّحِيَّةَ وَالسَّلَامَ وَ أَدْخِلْنَا دَارَ السَّلَامِ يَا ذَاالْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ». یارەببی لەبەر خاتری «مشعرالحرام» و «بیت‌الحرام» و «شهرالحرام» و ڕوکنی «حجرالأسود» و شوێنی حەزرەتی ئیبراهیمعليه السلام لە ئێمەوە بگەیێنە بە ڕۆحی پێغەمبەری ئازیز درووود و سەلام، بمانخەرە ناو بەهەشتەوە ئەی خاوەنی جەلالەت و کەرامەت.

سوننەتە تا ئەسفار لەوێ بمێنیتەوە و دوو ڕکات نوێژی سوننەتیش لە «مشعرالحرام»دا بکەی و ئەمجار لە شیوی «محصّر»وە بەرەو مینا بڕۆی.

***

## مانەوەی دوو شەو لە مینا و چۆنیەتی رەجم

کاتی ڕەجمی شەیتان لە دوای نیوەشەوەوە دەست پێ ئەکات، بەڵام سوننەتە دوا بخرێت تا خۆر ئەکەوێتە سەر کێوان، بەڵێ کاتێك گەیشتیتە مینا بڕۆ بۆ سێ جەمەرە، بەلام کارت بە جەمەرەی ئەووەڵ و

دووهەمەوە نەبێ، هەتا ئـەگـەیی بـە «جـمرةالعـقبة»، ئەمجار حەوت بەردی لێ بدە.

بزانە! «جمرة العقبة» سێهەم شەیتانە، ئەبێ لە ناوی شیوەکەدا بەرد بدرێ لە جەمەرە و سوننەتیشە لە کاتی ڕەجـم کـردنا ڕوو لە جـەمەرە بکـات و لای ڕاسـتی بکـەوێتە لای مـیناوە و لای چـەپیشی بکـەوێتە لای مەککەوە، ئینجا یەکەیەکە حەوت بەردەکەی لێبدات، بەڵام ئەوە تەنها بۆ ڕۆژی «یوم‌النّحر» ئەبێ، وەگەرنە لە ڕۆژانی دوای جەژندا کە مەشهوورن بە «ایّام‌التّشریق» بۆ هەموویان سـوننەتە لە کـاتی ڕەجـم کـردنیانا ڕوو بکەنە کەعبە، هەرچەند بڕێك فەرموویانە ئەگەر لە هەر چوارگۆشەیشەوە ڕەجم بکرێن هەر دروستە.

بزانە، وەخـتی ڕەمـی «جـمرةالعـقبة» سـێ کـاتە: (١ـ«فـضیلت» (٢ـ«اخـتیار» (٣ـ«جَـواز». کـاتی فەزیلەت، تـلووعی ڕۆژی جـەژنە تـا ڕۆژ لە خـەتی ئیستیوا لائەدا. کـاتی ئـیختیار، تـا غـورووبی ڕۆژی

جەژنە. کاتی جەواز، تا ئاخری «ایّامالتّشریق»ە. لە کاتی ڕەمیا سوننەتە بڵێی: «اللّٰهُ أَكْبَرُ عَلىٰ طاعَةِ الرَّحْمٰنِ وَرَغْمِ الشَّيْطانِ اللّٰهُمَّ تَصْدِيقاً بِكِتابِكَ وَاتِّباعاً لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ». دوای ڕەمی «جمرةالعقبة» سەر بتاشە یا کورتی کەرەوە. ئەم سەر تاشین و کورت کردنەوە بە تاشین یا قرتاندن یا دەرهێنانی سێ تاڵ موویش ئەبێ، جا ئەگەر کەسێ موو نەبێ بەسەریەوە، سوننەتە تێخ بێنێ بەسەریا. دوای حەلقی سەر ئیحرام بشکێنە و ئەگەر بۆت مومکین بوو بڕۆ بۆ مەککە و تەوافی ڕوکن ئەنجام بدە، پاشان بگەڕێرەوە بۆ مینا و واجبە لە مینادا دوو شەو بمێنیتەوە. ڕۆژی دووهەم و سێهەم ئەبێ بە تەرتیب ڕەجمی «جمرةالکُبری» و «جمرةالوُسطی» و «جمرة العقبة» بکەی و هەریەکێکیان حەوت بەردی لێبدەی، ئەبێ میلەکانیش بپێکی، نابێ لەباتی بەرد شتێکی تر بوەشێنی و ئەبێ ڕەمیەکە بە دەس بێت و نابێ بە قاچ بێ یا بە بەرزەقانێ و یا بە شتی تر، وە ئەبێ

حەوت جار بێ، نابێ بە یەکجار و یا بە دوو جار حەوت بەردەکە بدەی لە جەمەرە، وە ئەبێ لە ئەسڵەوە بەردەکە بۆ جەمەرە بخەی و هیچ مەبەستێکی ترت نەبێ.

بزانە، ئەنجامدانی ئەم چوار شتە: «١ـ رەجم کردنی شەیتان، «٢ـ سەربڕینی ئاژەڵ، «٣ـ تاشین یا کورت کردنەوەی مووی سەر، «٤ـ تەوافی ڕوکن، تەرتیب لە بەینیانا سوننەتە و واجب نییە. کە مادام وایە ئەگەر لە پێشا تەوافت کرد یا سەرت تاشی و دوایی ڕەجمی شەیتانت کرد دروستە و زەرەر و زیانی نیە. بەلاّم تەرتیب لەم سیانەدا واجبە: ١. ئەبێ ئیحرام پێشی هەموو ڕوکنەکان بکەوێ. ٢. وەستانی عەرەفات پێشی تەواف و حەلق بکەوێ. ٣. تەوافی ماڵی خوا پێش سەعی سەفا و مروە بێ.

بزانە! هەرکەس نەتوانێ خۆی ڕەجمی شەیتان بکا دروستە وەکیل بگرێ تا ڕەجمی شەیتانی بۆ بکا؛ بەلاّم

وەکیل ئەبێ لەپێشا بۆ خۆی ڕەجمی هەرسێ جەمەرە بکا، دوایی بڕواتەوە لەباتی وەکیلگرەکەی (موکّل) ڕەجمی شەیتان بکات.

بزانە، ڕەجمی ڕۆژانی «ایامِ‌التّشریق» لە دوای «زَوال»ەوە دەس پێ‌ئەکا و بە داچوونی ڕۆژیش کۆتایی پێ دێت. جا ئەگەر حاجی لە ڕۆژی دووهەمدا پێش ئاوابوونی ڕۆژ لە مینادا بڕواتە دەرەوە ئەوە دروستە و مانەوەی شەوی سێهەم و ڕەمی ڕۆژی سێهەمیشی لە کۆڵ ئەکەوێ. وە ئەگەر تا ڕۆژئاوا لەوێ مایەوە، ئەوە مانەوەی شەوی سێهەم و ڕەمیی ڕۆژی سێهەمیشی لەسەر واجب ئەبێ.

ئاگاداری! ئەگەر حاجی بە عەمد یا بە سەهو بۆی نەکرا لە ڕۆژی جەژندا ڕەمی «جمرة العقبة» بکات، ئەوە ئەتوانێ لە شەو و ڕۆژی تەشریقدا ڕەجمی «جمرة العقبة» بکات. وە ئەگەر بۆی نەکرا لە ڕۆژی تەشریقی ئەووەڵ و دووهەمیشدا ڕەمی جەمەرەکان

بکا، ئەوە بۆی هەیە کە لە ڕۆژی سێهەمدا زەنجیرەوار لە پێشا ڕەمی «جمرة العقبة»ی ڕۆژی جەژن بکات ئەمڕا بە تەرتیب ڕەمی «جمرة الکبری و وسطی و العقبة»ی ڕۆژی ئەووەڵ و دووهەم و سێهەمی تەشریق بکات، ئەم ڕەمی جەمەرانە کە لە ڕۆژی سێهەمدا بە تەرتیب ئەکرێن بە حازر حەسابە و نابێ بە قەزا (قضا) و کەفارەتی ناوێ. جا ئەگەر بۆی نەکرا ڕەمی هیچکام لە جەمەرەکان بکا، یان بڕێکیانی تەرك کرد، یان سێ بەردی نەوەشاند بۆ جەمەرەکان، ئەوە لەسەری واجبە حەیوانێك سەر ببڕێ لە کەفارەتا، یان دە ڕۆژ بەڕۆژوو بێ، هەروەها ئەگەر شەوێك لە مینا بەبێ عوزر و بەهانە نەمایەوە، ئەوە لەسەری واجب ئەبێ کە مستێك دانەوێڵە بدات؛ وە ئەگەر دوو شەو نەمایەوە ئەبێ دوو مست بدا، وە ئەگەر هیچ شەوێك لە مینادا نەمایەوە، ئەوە ئەبێ مەڕێك سەربڕێ یان دە ڕۆژ بەڕۆژوو بێ.

جا هەرکات دوو ئەمر لە حەلق و ڕەمی و تەواف

ئەنجام درا، «تَحلُّل»ی ئەووەڵ حاسڵ ئەبێ، ئیتر حەڵاڵە لیباسی دووریاو بپۆشێ و سەر بتاشێ و نینۆك بکا، هەرکاتێك هەرسیانیان جێبەجێ کران تەحەللولی دووهەمیش حاسڵ ئەبێت و باقی قەدەغەکراوەکانی بۆ حەڵاڵ ئەبێ.

***

## باسی عومرە

*ـ حاجی، عومرەیش وەك حەج واجبە، خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَ أَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ بۆ خوای گەورە حەج و عومرە جێبەجێ بکەن. جا ئەگەر دوای ڕچاو کردنی ئەحکامی حەج گەرەکت بوو عومرە بکەی بڕۆ بۆ تەنعیم یا جەعرانە یا حودەیبییە و لە یەکێ لەو سێ شوێنەدا سوننەتە غوسڵ بکەی و واجبیشە لیباسی ئیحرام بپۆشی و بە دڵ نیەت بێنی. وە سوننەتیشە بە زبان بڵێ: قەسدم هەیە عومرە ئەکەم و ئیحرام بە عومرە ئەبەستم بۆ خوای تەعالا و

سوننەتیشە بە دەنگی بەرز بڵێی: «لَبَّيْكَ اللَّـهُمَّ لَـبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْك لا شَرِيكَ لَكَ». سوننەتە عومرەی زۆر بكەی، بەتایبەت لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا. «ابـن‌عباس» ﷺ ئـەڵێ: پـێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموویەتی: یـەك عـومرە لە ڕەمەزاندا سەوابی یەك حەجی هەیە. یا فـەرموویەتی: سەوابـی حـەجێكی هـەیە كـە لەگـەڵ مـنا كـردبێتی. «قال ﷺ: عُمْرَةٌ في رَمَضانَ تَعْدِلُ حَجَّةً. و في رواية: عُمْرَةٌ في رَمَضانَ تَعْدِلُ حَجَّةً مَعي». بەڵام لە غـەیری ڕەمەزانا سێ عومرە جا سەوابی حەجێكی هەیە. جـا ئەگەر لە تەنعیمدا ئیحرامت پۆشی ئەوە سوننەتیشە لە مزگەوتی حەزرەتی عایشەدا ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ دوو ڕكات نوێژی سـوننەت بكـەی و ئـەمجار بـڕۆی بـۆ تەوافی ماڵی خوا و لە ڕێدا بە زۆری و بە دەنگی بەرز وشەی تەلبیە بخوێنی تا داخڵی «مسجدالحرام» ئەبی، ئەمجار واز لە تەلبیە بێنی و دەست بكەی بە تەوافـی

ماڵی خوا، حەوت جار بە دەوریا بگەڕی و موراعاتی واجبات و مەسنووناتی تەوافی ماڵی خوا بکەی وەك لە ڕۆژانی حەجدا کردووتە بەبێ فەرق و جیاوازی، جـا دوای تەواف برۆ سەعی مابەینی سەفا و مەروە ئەنجام بـــدە وەك لە ڕۆژانــی حــەجدا ئـەنجامت داوە، وە لە مەروەدا حەلقی سەر بکە یا کورتی بکەرەوە.

پرسیار: ئایا بەر لە کردنی حــەج دروســتە عـومرە بکرێ یا نە؟

وەڵام: بـەڵێ، چـونکە پـێغەمبەری ئـازیزﷺ بـەر لەوەی حەج بکات سێ عومرەی کردووە: ١. لە مانگی «ذی القعدة»ی ساڵی شەشی کۆچی بەرانبەر بە ساڵی ٦٢٨ی زایینی کە مەشهوورە بە ساڵی حودەیبییە. ٢. لە مانگی «ذی القعدة»ی ساڵی حەوتی کۆچی بەرانبەر بە ٦٢٩ی زایینی کە مەشهوورە بە «عمرة القـضاء». ٣. لە ساڵی هەشتی کۆچی بەرانبەر بــە ســاڵی ٦٣٠ زایـینی ڕێکەوتی ساڵی غەزای حونەین و فەتحی مەککە کـە

مەشهوورە بە عەمرەی جەعرانە. بەڵام لە ساڵی ١٠ی کۆچی بەرانبەر بە ٦٣١ی زایینی لەگەڵ ڕچاو کردنی حەجیشدا عومرەی جێبەجێ کردووە کە مەشهوورە بە «حجة الوداع»[1].

عومرە لە لۆغەتا بە مەعنا زیارەتە، وە لە شەرعا قەسدی ماڵی خوایە بۆ عیبادەت بە چەن مەرجێکی تایبەتی.

حەج لە لۆغەتا قەسدی شتی گەورەیە، وە لە شەرعا قەسدی ماڵی خودایە بۆ عیبادەت.

«فرع» هەرکەسێ بڕوا بۆ شاری مەککە و قەسدی حەج و عومرەی نەبێ، ئەوە سوننەتە کە ئیحرام بە حەج یا بە عومرە ببەستێ وە لە فەرموودەیەکا واجبە. مەگەر هاتووچۆی بۆ مەککە زۆر بێ، وەکوو دارفرۆش و شۆفیر و وێنەی ئەمانە... کە مادام وایە ئەگەر حەجاج لە

(١) ارشاد الساری جلد ٣، ص٢٦٢ تا ٢٦٥.

شاری مەککەدا هاتنە دەرەوەی حەرەم بۆ ئیسراحەت وەیا بۆ زیارەت، وەکوو زیارەتی کێوی عەرەفات یا شوێنانیتر کە جوزئی حەرەم نەبن، ئەوە بۆیان سونەتە کاتێ کە ئەگەڕێنەوە ئیحرام بە عومرە ببەستن جا بێنەوە بۆ حەرەم. بزانە مینا و موزدەلیفە داخڵی حەرەمن.

ئاگاداری ، حاجی، عومرەگوزار، یا هەرکەسێکیتر کە ئەتەوێ لە مەککەدا بچیتە دەرەوە، لەسەرت واجبە کە «طواف الوداع» بکەی و نابێ لە دوای «طوافالوداع» لە مەککەدا بمێنیتەوە و خەریکی کڕین و فرۆشتن یا خەریکی سەعی مابەینی سەفا و مەروە یا هەرکارێکیتر وەکوو سەردان لە ڕەفێقان و خوێشان بکەی، یا عەیادەتی نەخۆشان، بەڵکوو ئەبێ لە هەوڵی چوونە دەرەوەدا ببی، جا ئەگەر کەمتەرخەمیت کرد و زوو نەچوویتە دەرەوە و بەبێ عوزر و بەهانە و ماتڵ بوون بە دیاری ڕەفێقانەوە مایتەوە، ئەوە ئەبێ دووبارە

تەوافی خواحافیزی بکەیتەوە، ئەگەر بەمجۆرەت نەکرد، ئەوە کەفارە لەسەرت واجب ئەبێ کە سەربڕینی حەیوانێکە. بەڵام ئەگەر ژنێ کەوتە عادەتی شەرعییەوە، ئەوە بێ «طوافالوداع» ئەتوانێ لە مەککەدا بچێتە دەرەوە و کەفارەتیشی لەسەر نیە.

***

## مەرجی دروست بوونی حەج و عومرە

حاجی، مەرجی دروست بوونی حەج و عومرە ئیسلامییەتە، جا ئەگەر منالْ و کۆیلە و هەژار حەج و عومرەیان کرد ئەوە دروستە. سەرپەرشتکاری مندالْ و شێت بڵێ: قەسدم هەیە ئەم کوڕەم یان ئەم کچەم حەج یا عومرەی پێ بکەم، ئیحرامی حەجم بەست یا ئیحرامی عومرەم بەست. جا ئەگەر منداڵەکە فامیدە بوو، ئەوە خۆی ئەتوانێ نیەتی ئیحرامی حەج یا عومرە بێنێ و هەر خۆی تەواوی ئەحکامەکانیان ڕچاو بکات. جا ئەگەر هەژارەکە دوایی دەوڵەمەن بوو ئەوە لازم ناکا

حەج و عومرە بكاتەوە، بەڵام ئەگەر مناڵەكە بلووغی بوو یا كۆیلەكە ئازاد كرا ئەوە لەسەریان واجبەكە حەج و عومرە بكەنەوە.

حاجی، مەرجی وجووبی حەج و عومرە چوارن: (١ ئیسلامییەت، (٢ تەكلیف، (٣حوڕڕییەت، (٤ «استطاعة»، ئیستیتاعەیش دوو بەشە: «یەك تەوانایی بەدەنییە كە بە نەفسی خۆی بتوانێ حەج و عومرە بكا، ئەمەیش خاوەنی چوار مەرجە: (١. ئەبێ ئەندازەی نەفەقەی عەیال و مناڵ و خەرج و مەسرەفی چوون و هاتنەوەی ببێ. (٢.كەسێ ماڵی دوو مەنزڵ لە مەككەوە دوور بێ ئەبێ ڕاحیلەی ببێ، ئیتر هی خۆی بێ یا بە ئیجارە بیگرێ. (٣. ڕێگە ئەبێ ئەمین بێ. ٤.بەبێ ڕەنج و زەحمەت بتوانێ سواری سەیارە یا تەیارە ببێ.

«بەشی دووهەمی ئیستیتاعە: بەدەست هێنانی حەجە بەهۆی كەسێكی ترەوە، چوون خۆی ناتوانێ حەج و عومرە بكات ئەبێ وەكیل بگرێ و «أُجرةالمثل»

(کرێی هاووێنەیی) یا کەمتر لە هاووێنەیی بدا پێی و بینێرێ تا لەجیاتی حەج و عومرەی بۆ بکا، بەڵام لازم ناکا بەشی نەفەقەی ماڵ و منالی ببێ تا وەکیلەکەی بڕوا و بێتەوە، وە ئەگەر کەسێ مرد و حەج و عومرەی لەسەر واجب بوو ئەبێ بە میراتەکەی کەسێ بنێرن تا حەج و عومرەی بۆ بکات.

ئاگاداری ، ئەگەر یەکێ وتی بە یەك کەوتوویەك: حەج و عومرەت بۆ ئەکەم خوا ئەولاد بێ یا بێگانە ئەوە لەسەری واجبە قەبووڵی بکا، وە ئەگەر بۆ خەرج و مەسرەفی حەج و عومرە پووڵیان پێدا واجب نییە قەبووڵی بکا.

ئەگەر حاجی قەدەغە کرا لە حەج و عومرە کردن خوا کافر قەدەغەی بکا یا موسوڵمان، ئەوە ئەتوانێ ئیحرام بشکێنێ، بەڵام هەر لەو شوێنەدا ئەبێ لە کەفارەتا حەیوانێك سەرببڕێ و بیدا بە هەژارانی ئەوێ و حەلق یا تەقسیر بکا و نیەتی هەڵوەشاندنەوەی

ئیحرامیش بهێنێ، جا ئەگەر حەیوانی دەس نەکەوت ئەبێ قیمەتی حەیوانەکە بەراوەرد بکا و بە قیمەتەکەی تەعام بکڕێ و بیدا بە هەژارانی ئەو شوێنەکە حەج و عومرەکەیان لێ قەدەغە کردووە، جا ئەگەر ئەوەیشی پێ نەکرا ئەبێ لە بەرابەری هەر موددێ تەعام ڕۆژێك بەڕۆژوو بێ، ئەمجار ئەگەر حەج و عومرەکە لەسەری واجب بووبوون ئەوە ئەبێ بێ دواخستن و تەفرەدان ئەنجامیان بداتەوە، بەڵام بەو شەرتە ساڵێك بەر لە قەدەغەکردنەکە حەج و عومرەی لەسەر واجب بووبێ، وەگەرنە قەزایان نییە و هەر کەفارەت واجبە. ئەگەر

حاجی وەستانی عەرەفەی فەوتا ئەوە لەسەری واجب ئەبێ ئیحرامی خۆی بە کردەوەکانی عومرە حەڵاڵ بکا واتە بە تەواف و سەعی مابەینی سەفا و مەروە و حەلقی سەر تەحەللول بکا و سەرێ حەیوان سەر ببڕێ و حەجەکەشی قەزا بکاتەوە، جا بزانە لە کاتی قەزای حەجەکەدا حەیوانەکەیش سەر

ببڕێ.

خۆلاسە، ئەو حەیوانانە كە لە كەفارەتا ئەدرێن بە ئیعتیباری بڕیار و حوكم چوار بەشن: (١. خوێنی «ترتیب و تقدیر» ڕیز و دیاری كراو. (٢.«ترتیب و تعدیل» ڕیز و بەراورد كراو. (٣.«تخییر و تقدیر» سەرپشكی و دیاری كراو. (٤.«تخییر و تعدیل» سەرپشكی و بەراوەرد كردن. خوێنی «ترتیب» یانێ لە كەفارەتا هەر حەیوان سەر ببڕێ و دروست نییە لە حەیوان سەربڕینەوە لابدرێ بۆ دانەوێڵەدان و ڕۆژوو گرتن، مەگەر توانایی بەسەر حەیوان سەر بڕیندا نەبێ. «تقدیر» یانێ قیمەتی ئەو حەیوانە كە دروستە لەباتی حەیوانەكە بدرێ بە بەراوەردی شەرع وا دیاری كراوە نابێ كەم و زیادی تیا بكرێ.

خوێنی «ترتیب و تقدیر» شامیلە بەسەر «١ خوێنی تەمەتتوع، یانێ خوێنی بەلەززەت. «٢ قیران، «٣ فەوتانی وەستانی عەرەفات. «٤ نەكردنی فەرمان پێ

کراو، وەکوو نەبەستنی ئیحرام لە میقاتدا، وە نەکردنی ڕەجمی شەیتان و نەمانەوەی شەو لە موزدەلیفەدا و نەمانەوەی دوو شەو لە میندادا و نەکردنی «طواف‌الوداع».

خوێنی «ترتیب و تعدیل» شامیلە بەسەر ئەو خوێنەدا کە بەهۆی جیماع کردنی حەج تێکدەرەوە پەیدا ئەبێ، یانێ شەرع ئیجازە ئەدا بە بەراورد کردنی قیمەتی حەیوان لە حەیوان سەربڕینەوە لا بدرێ بۆ غەیری حەیوان. خوێنی کەفارەتی جیماع بەم تەرتیبەیە: ئەووەڵ وشترێك، جا ئەگەر وشتر دەست نەکەوت ئەوە مانگایەك واجبە، وە ئەگەر مانگایش نەبوو ئەوە حەوت سەر مەڕ واجبە، وە ئەگەر مەڕیش دەست نەکەوت ئەوە ئەبێ وشترێك بە پارە بەراورد بکرێ و بەو پارە دانەوێڵە بکڕێ و بدرێ بە هەژارانی حەرەم. جا ئەگەر تەوانایی تەعام کڕینیشی نەبوو ئەوە ئەبێ لەباتی هەر یەکسەدوبیستویەك مسقاڵ دانەوێڵە

ڕۆژێك بەڕۆژوو بێ، وە موشتەمیلیشە بەسەر خوێنی قەدەغە كراودا (احصار). خوێنی قەدەغە كراویش بەم تەرتیبەیە: ئەووەڵ یەك سەر مەڕ و بزنە، وە ئەگەر مەڕ و بزنیش دەست نەكەوت ئەوە ئەبێ یەك سەر مەڕ یا یەك سەر بزن بەراورد بكرێ و بە قیمەتەكەی دانەوێڵە بكڕێ و بیدرێ بە هەژارانی حەرەم، جا ئەگەر تەوانایی ئەوەیشی نەبوو ئەوە ئەبێ لەباتی هەر یەكسەدوبیستویەك مسقاڵ دانەوێڵە یەك ڕۆژ بەڕۆژوو بێ.

خوێنی «تخییر و تقدیر» واجب ئەبێ بەهۆی «١ سەر تاشین، «٢ نینۆك كردن، «٣ بەكار هێنانی شتی بۆنخۆش، «٤ بە پۆشینی بەرگی دووراو، «٥ بە داپۆشینی سەری پیاو، «٦ بە داپۆشینی دەمووچاوی ژن، «٧ بە ڕۆناوی كردنی مووی سەر و ڕیش و سمێڵ، «٨ بە ماچ كردنی ژن و دەسبازی كردن لەگەڵیا، «٩ بە ئیستیمناء خۆ ڕەحەت كردن. ١٠ جیماعی نێوانی

هەردوو حەلاڵ بوونەکانی حەج. لەم دە بەشە خوێنانەدا حاجی سەرپشکە لە بەینی حەیوان سەر بڕیندا و دانی دانەوێڵە بە هەژارانی حەرەم و لە ڕۆژوو گرتندا، هەرچەن تەوانایی حەیوان سەر بڕینیشی ببێ، مەسەلەن ئەگەر حاجی سێ تاڵ مووی سەری یا هەر ئەندامێکی تری لابرد یا نینۆکی کرد ئەوە مەیل خۆیەتی حەیوان سەر ببڕێ یا سێ ساع گەنم بدا بە شەش هەژاری حەرەم هەریەکێ نیو ساع، یا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ.

«تخییر و تعدیل» ، موشتەمیلە بەسەر خوێنی کەفارەتی نەچیر و درەختا، واتە کەفارەت بە هۆی کوشتنی نەچیر و بڕینی درخت و گیا واجب ئەبێ.

مانیعی حەج و عومرە شەشن:

«١. «احصار»ی عاممە، یانێ قەدەغەی تەواوی حاجیان و عومرەگوزاران بکرێ و نەهێڵن لە هیچ ڕێگەییکەوە بڕۆن بۆ حەج و عومرە.

«٢. «احصار»ی خاسە، یانیٚ یەك نەفەر حاجی بە ستەم زیندان بکریٚ و قەدەغەی بکەن لە حەج و عومرە. بەڵیٚ «احصار» چ عام بیٚ چ خاس دوای قەدەغە کردنیان لە حەج و عومرە بۆیان دروستە کە تەحەللول بکەن، واتە بۆیان حەڵاڵە کە ئیحرام بشکیٚنن و سەر بتاشن و حەیوان سەر ببڕن لە کەفارەتا. بەڵام نەخۆش ناتوانیٚ خۆی حەڵاڵ بکا و ئیحرام بشکیٚنیٚ مەگەر بە مەرجی گرتبیٚ ئەگەر نەخۆش بکەویٚ ئیحرام بشکیٚنیٚ.

«٣.کۆیلەگەری، ئەگەر کۆیلە بەبیٚ ئیجازەی سەرۆکەکەی ئیحرامی پۆشیبیٚ ئەوە سەرۆکەکەی ئەتوانیٚ کە ئیحرامەکەی پیٚ بشکیٚنیٚ چوون حەج و عومرەی لەسەر واجب نیە، بەڵام ئیتاعەی سەرۆکەکەی واجبە.

«٤.ژنیەتی، ئەگەر ژن بەبیٚ ئیجازەی میٚردەکەی ئیحرامی پۆشیبیٚ ئەوە میٚردەکەی بۆی هەیە ئیحرامی پیٚ بشکیٚنیٚ خوا سوننەت بیٚ یا واجب.

«٥. باوکییەتە، ئەگەر ئەولاد بەبێ ئیجازەی باوك یا دایك ئیحرامی پۆشیبێ، ئەگەر فەرز بوو ئەوە ناتوانن پێی بشکێنن، بەڵام ئەگەر سوننەت بوو ئەتوانن پـێی بشکێنن.

«٦. قەرزارییە، قـەرزدەر نـاتوانـێ ئـیحرامـی پـێ بشکێنێ، بەڵام ئەتوانێ کە نەیەڵێ بڕوا بۆ حەجەکەی تا قەرزەکەی لێ وەرنەگرێتەوە، مادامێ قەرزارەکە بیبێ و وەختی قەرزەکەیشی هاتبێ.

((فرع))

١. هەر جۆر حەیوانی کێوی کە گۆشتی بخورێت با گیراو بێ و لینی کرابێ وەك بزنەکێوی و مەڕەکێوی و گاکێوی و کۆتر و کەو و بولـبوڵ و قـومری و وێـنەی ئەمانیشە، کوشتنیان حەرامەو کەفارەیان لازمە.

٢. ئەگەر هەرجۆر لەم حەیوانانە و باڵندانەی لینی کردبوو، ئەوە لەسەری واجـبە بـەرەڵلایان بکـا، یـان بیانبەخشێ بە کەسێکی تر.

٣. هەر جۆر حەیوانی كێوی ببێ، لە مڵكی دەرئەچێت و هەركەسێكی تر بیگرێ ئەبێتە مڵكی.

٤. ئەگەر سەیارە یان ولاغێكی بوو كە بەهۆی ئەو سەیارەوە یان ئەو ولاغەوە حەیوانێكی لە بەین برد، ئەبێ بیبژێرێ.

٥. ئەگەر سەگێكی كردە حەیوانێكی كێوی و لە ناوی برد، ئەوە ئەبێ بیبژێرێت.

٦. ئەگەر داوی ناوە و كەوی پێوە بوو، وە یا تەڵەی داناو حەیوانێكی پێوە بوو، ئەبێ بی‌بژێرێت.

٧. هەر حەیوانێكی كێوی سەر ببڕێ گۆشتەكەی حەرام ئەبێت و بە مردارەوە بوو حەساب ئەكرێ.

٨. هەڵگرتنی هێلكەی كەو و كۆترو وێنەی ئەمانە لەسەری حەرامە.

٩. سەر بڕینی حەیوانیماڵی و ئاوی وەك گا و كوێرەكە و بزن و مەڕ و مریشك و ماسی و... دروستە و كەفارەتی ناوێ.

١٠ كــوشتنی حـەیوانـی زیـانبەخش وەك مـار و دووپشك و سەگی گازگر و گورگ و ورچ و شێر و پڵنگ و هەڵۆ و قاڵاو و كۆلارە و مشك سوننەتە.

١١. كــوشتنی هــەنگ و مـێلوورە و پـەڕەسێلكە دروست نیە، هەرچەند كەفارەتیش پێویست ناكات.

١٢. كوشتنی حەیوانێك كە هەم سوودی هـەبێ و هەم زیان، وەك باز و یۆز مەباحە.

١٣. كوشتنی خاوەن ژیانێك كـە سـوود و زیـانی نەبێ، وەك قرژانگ و قالۆنچە و وینەی ئەمانە مەكروهە.

١٤. حوكمی بژاردنـیان لە بـاسی كـەفارەتا بـەیان كراوە.

دوای عەمەلی زاهیری باش وایە كە باسی عەمەلی باتینی حەج و عومرەیش بكەین.

## عەمەلی باتینی حەج و عومرە
## بریتین لە بیست خاڵ:

١. فەهم، وەها بزانی کە بە زاتی یەزدان ناگەیی و ڕەحمەت و بەزەیی ئەو تۆ داگیر ناکا تا بە تەواوی لە ئارەزوو بازی و شەهەوات و خۆ بە گەورە گرتن و نەفس پەروەردە کردن دووری نەگری، حەج و عومرەت قەبووڵ نابێ و وەرناگیرێ تا تەواوی حەرەکات و سەکەناتت حەواڵەی زاتی ئەقدەس نەکەی.

٢. شەوق، واتە عیشق و عەلاقەی گەرم و گوڕت بۆی بێ و قەسدی بەیت بکەی و وا بزانی کە قەسدی یەزدان ئەکەی.

٣. عەزم، وا بزانی بەخاتر ڕووبەڕوویی و زیارەتی ماڵی خواس دووریت گرتووە لە ئەهل و ئەولاد و باوك و دایك و هۆز و خوێش و وەتەن و ئارەزووبازی.

٤. «قطع العلایق»، واتە تەوبە بکەی و دووری بگری

لە هەرچی گوناهە و پەشیمان بێ لە عەقیدە و عەمەڵ و وتاری ناڕەوا و لە هەرکەس زوڵم و ستەمیشت کردووە بیدەیتەوە و خۆت بە بچووك و تاوانبار بزانی.

٥. ئەبێ تەڵەبی ڕزق و ڕۆزی حەڵاڵ بکەی.

٦. لازمە لە بەرابەری ئەو نیعمەتە زۆرانە کە خوای گەورە بە تۆی داون بە وتن و عەمەڵ و دڵ و دەروون شوکر و سوپاسی بێ پایانی بکەی.

٧. کاتێ کە لیباسی ئیحرام ئەکری ئەبێ وا بزانی کە لیباسی کەفەن ئەکری و ئەیپێچی بە خۆتەوە و بەرەو حوزووری خواکەوتوویتەسە ڕێ و ئامادەی سوئال و جەوابی نەکیر و مونکەری.

٨. کاتێ لە ماڵ و مەنزڵ و دێ و شارا ئەچیتە دەرەوە ئەبێ بزانی بۆ کوێ ئەچی و بۆچی ئەچی و نیازی چیت هەیە و ئیرادەی چی ئەکەی و زیارەتی کێ ئەکەی. ئەبێ دەرکی ئەوەت ببێ وێنە و میسلی ئەم سەفەرتە لە دونیادا نییە و دەستناکەوێ.

٩. کاتێ دەست ئەکەی بە «لبّيك اللّهمّ لبّيك» ئەبێ ئیمان و عەقیدەت وابێ کە جوابی بانگەوازی خوات داوەتەوە هیوا و ئاوات و ئارەزووت بـبێ کـە خـوای گەورە لێت ورئەگرێ و قەبووڵی ئەکا و بیم و ترسیشت بێ کە لێت ورنەگرێ و قەبووڵی نەکا، ئەبێ بیشزانی کاتێ پۆشینی لیباسی ئیحرام و تەلبیە کـردن شـوێنی خەتەر و ئەووەڵی ئەمرە، بەڵام بە تەوەککـول لەسـەر خوای گەورە ئیحرام بپۆشە و دەست بکـە بـە «لبّـيك لبّيك». سەفیانی کوڕی عـویەینە فـەرموویەتی: عـەلی کوڕی حوسەین -رەزای خوای لێبێ- کاتێ ئیحرامی پۆشی و سواری ڕاحیلە بوو ڕەنگی گۆڕیا و زەرد بوو و لەرزش کەوتە ئەندامی و تەوانایی تەلبیە کردنی نەما، پێیان وت بۆچی تەلبیە ناکەی؟ لە جوابدا فـەرمووی: ترسی ئەوەم هەیە کە «لا لبّيك و لا سعديك» جوابم بێ، جـا کـاتێ تـەلبیەی کـرد لە سـەر هـۆش چـوو و لە ڕاحیلەکەی کەوتە خوارەوە.

١٠. کاتێ ئـەکـەویتە ڕێ و دەشت و دوڵ و چـیا ئەگریتە بەر و بەرەو میقاتەکان ڕووبەڕوو ئەبی، ئەبێ وابزانی کە ئەمری و دونیا و ماڵ و مناڵ بەجێ دێڵی و بەرەو گۆڕ و قیامەت و سەرای مەحشەر کەوتوویتەسە ڕێ و ناڕەحەتی و نیگەرانی قەبر و گێژەلوولەی ڕۆژی جەزا و سزا داگیرت ئەکا و گرفتار و سەرگەردان و ڕێ گوم کردووی و ئامادەی پرسیاری مەلائیکەی گۆڕ و حیساب و کیتابی ڕۆژی ئاخیرەتی و نازانـی هـێژای سەوابی یا سزاو عەزابی.

١١. کاتێ واریدی شاری مەککە ئەبی ئەبێ وابزانی کە واریدی گەورەترینی نوقتەی سەر زەوی بـوویت، ئارەزوو و ئاواتیشت ئەوە بێ کە خوا ئـەتپەزێرێ و وەرت ئەگرێ و لە گوناهەکانت خۆش ئەبێ و لە سزا و عەزاب ئەتپارێزێ و ترس و بیمی ئەوەیشت بێ کـە نەتپەزێرێ و لێت خۆش نەبێ.

١٢. کاتێ چاوت بە بەیت ئەکەوێ ئەبێ گەورەیی و

عەزەمەتی بەیت وا دەرك بکەی کە خاوەنی بەیتت موشاهەدە کردوو، لێی ئەپاڕێتەوە و داوای لێ ئەکەی تا لیقای خۆی بکا بە نەسیبت، وەك چاو کەوتنی بەیتی کردووە بە نەسیبت.

١٣ کاتێ کە تەوافی ماڵی خوا ئەکەی ئەبێ وا بزانی کە نوێژ ئەکەی و ماڵی خوا زۆر بە گەورە بگری و خوات زۆر خۆش بوێ وا بزانی وەکوومەلائیکە وایتە کە بە دەوری عەرشا تەواف ئەکا و ئەسووڕێتەوە.

١٤. کاتێ ئیستیلامی «حجرالاسود» ئەکەی ئەبێ وابزانی کە بەیعەتت بە زاتی یەزدان کردووە و دەستت داوە بە دەستی خواوە و پەیمانی لەگەڵا ئەبەستی و بە قەراری قەتعی پەیمانەکەت ناشکێنی و خاوەنی وەفا ئەبی. وایش بزانی ئەگەر موخالەفەی وەعدەکەت بکەی موستەحەققی سزا و عەزاب ئەبی.

ﷺ ئیبن‌وعەبباس ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «حجرالاسود» دەستی خوایە بەو

دەستیشە لەگەڵ ئینساندا دەستومشتاق و موسافەحە ئەكا وەك پیاو لەگەڵ برای خۆیدا موسافەحە ئەكا «وَ قَدْ رَوَی ابْنُ عَبّاسٍ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: الْحَجَرُ الْاَسْوَدُ يَمِينُ اللّٰهِ عَزَّوَجَلَّ فِي الْاَرْضِ يُصَافِحُ بِهَا خَلْقَهُ كَمَا يُصَافِحُ الرَّجُلُ أَخَاهُ»[1].

١٥. كاتێ بە مولتەزەم ئەگەی ئەبێ تەڵەبی نزیكی و لوتف و ڕەحمەت و بەرەكەت و خۆشبەختی و عەفوو غوفران و چاوپۆشی لە زاتی یەزدان بكەی و زۆر مەحەبیەتی بەیت و خاوەنی بەیتت ببێ و داوای لێ بكەی تا سەربەرزی دین و دونیات بكا و لە سزای گەورە و ئاوری دۆزەخ بتپارێزی.

١٦. كاتێ سەعی مابەینی سەفا و مەروە ئەكەی ئەبێ وابزانی وای لە حوزووری خوادا و ئەتەوێ بەم هاتووچووە بەندایەتی خۆت دەربڕی و ئیزهاری

(١) احیاء: ج١ ص:٢٤٢.

خلووسی نیەت بکەی و لە حەوشی «ملك‌الملوك»دا قەرارت گرتووە و بە هیوای لوتف ڕەحمەتی ئەوی و ئەگەر ڕای ئەووەڵ نەتبەخشێ و نەتپەزێرێ لە ڕای دووهەم و سێهەم یا چوارەم و پێنجەم یا شەشەم و حەوتەمدا بەزەیی پێتدا دێتەوە و ئەتبەخشێ و ڕەحمەتی بۆت ئەجووڵێ و تەوبەت لێ وەرئەگرێ، هەروەها ئەبێ وابزانی لەبەینی دوو کەفەی ترازوودا قەرارت گرتووە، تەشبیهی سەفا بکەی بە کەفی حەسانەتەوە و مەروە بکەی بە کەفی سەییئاتەوە و هیوای سەنگینی حەسەنات و بیمی سووکی حەسەناتیشت بێ، تەردیدیشت بێ لە بەینی عەزاب و غوفراندا.

١٧. کاتێ داخڵی عەرەفات ئەبی ئەبێ بیر و بڕوات وابێ کە پەنات بە گەورەترین شوێن بردووە و جێگەی بەزەیی و ڕەحمەتی خوایە و جێگەی پاڕانە و نەزەر و ڕەزایەتی پەروەردگارە، کاتی فیوزاتی فراوان و ڕاز و

نیاز و زەمزەمەی ئیماندارانە، جێگە و مەكانی ئەنبیا و ئەولیا و عولەما و ئەبدال و ئەوتاد و ئەقتاب و هۆز و چینی سالْحان و ئیمانداران و خاوەن عەقڵانە. ئەوانیش بە جۆش و خرۆش و سۆزی دڵ و دەروونەوە لە زاتی یەزدان داوای بەزەیی و ڕەحمەت و بەرەكەت و كەرەم و بەخشین بە هەرچی لۆغەت و لەهجەیە ئەكەن و خوایش لێیان وەرئەگرێ، ئەبێ تۆیش بە عیشق و عەلاقەیەكی گەرم و گوڕەوە خۆت بخەیتە ناو زومرە و زەنجیرە و سیلسیلەی ئەوانەوە، بە هیوای ئەوە كە لە ڕۆژی قیامەتا لەناو جەماعەت و كۆمەڵی ئەواندا زیندوو و حەشر بكرێیتەوە. جوابی «لبّیك لبّیك»ەی تۆیش وەك ئەوان «لبّیك لبّیك» بێ و «لا لبّیك و لا سعدیك» نەبێ «الْمَرْءُ يُحْشَرُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ»

لە عەلی كوڕی موقیفەوە ڕیوایەت كراوە كە فەرموویەتی: چووم بۆ حەج و شەوی عەرەفە لە مزگەوتی خیفا لە مینادا خەوتبووم، لە خەوا بینیم لە

ئـــاسمانەوە دوو مـــەلائیكەی لیـــباس سـەوز هـاتنە خوارەوە یەكێكیان بـەوی‌تریانی وت: ئـەی بـەندەی خوا، ئەزانی ئەمساڵ چەند نەفەر بۆ حەج هاتوون؟ لە جوابدا فەرمووی: نازانم، ئەویش فەرمووی: ئـەمساڵ شەشسەد هەزار نەفەر هاتوون، ئەمڕا فەرمووی: ئەزانی لە چەند نـەفەریان حـەج قـەبووڵ كـراوە؟ فـەرمووی نازانم، ئـەویش فـەرمووی: شـەش كـەسیان، دوایـی چوونەوە بۆ ئاسمان و لەبـەر چـاو مـندا ون بـوون و داچڵەكام، زۆر نیگەران بووم و هەم و غـەم داگـیری كـردم و لە دڵ خـۆمەوە ئـەموت: وەخـتێ لە شـەش كەسیان حەج قەبووڵ كرابێ ئەبێ كەی من لەو شەش نەفەرە بم، تا لە كێوی عەرەفاتداگەڕامەوە و هاتمەوە بۆ مزگەوتی «مشعرالحرام»، هەر بیرم لە زۆری حەجاج و لە كەمی حەج قەبووڵ كراوان ئەكردەوە تا خەو داگیری كردم و هەردوو مەلائیكەكانم لە خەوا بینییەوە، سوئال و جوابی شەوی ڕابوردوویان تیكرار كردەوە، دوایی بە

ڕەفێقەکەی فەرموو: ئەزانی خوای گەورە لەم شەوەدا چی کرد؟ ئەویش فەرمووی نازانم، فەرموویان بەخاتر هەریەك نەفەر لەو شەش نەفەرە حەجی یەکسەد هەزار نەفەری قەبووڵ کردوو حەجی هەر شەشسەد هەزارەکەی وەرگرت، منیش لە خەو ڕاپەڕیم و زۆر خۆشحاڵ و مەسروور بووم.

١٨. لەکاتێکاکە ڕەجمی شەیتان ئەکەی ئەبێ قەسد و نیەتت وابێ کە ئیزهاری گەردنکەچی و بەندایەتی و ئیمتیسالی ئەمری خوا ئەکەی، عەلاوە پەیڕەویت لە ڕچە و ڕێبازی حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل و ئیسماعیل کردووە، هەرچەن بە زاهێر ڕەجمی جەمەرەکان ئەکەی بەڵام ئەبێ وابزانی لە حەقیقەتدا لە دەمووچاوی شەیتانت داوە و لووتت ڕەق کردووە و پشتت شکاندووە.

١٩. کاتێ داخڵی شاری مەدینەی مونەووەرە ئەبی و چاوت بە دار و دیواری ئەکەوێ ئەبێ بیر بەوە بدەی

كە ئەم شارە سەنگەر و مەركەزی دین و پەناو مەلجەئی ئیمانداران و جێگەی زاهیر بوونی وەحـی و بـنەما و بنەڕەتی حكوومەتی ئیسلامی و ئـەحكام و بـڕیاری شـەرعی و سـەرچـاوەی هـیدایـەت و حـەقیقەت و یـەكـتاپەرستی و «فـیوضات»ی ڕەحـمانییە، خـوای گەورەیش بۆ پێغەمبەری ئـازیزی هـەڵبژاردووە و بـۆ ئـــەوێ دەعـــوەتی كـــردووە، ئـــەویش ئـــیجابەی دەعوەتەكەی فەرمووە و بۆ ئەوێ هیجرەتی كردووە و بە خاتر تەقویەت و بەرزی دینی ئیسلام و ڕەزایـەتی ئیلاهی و حەق و مافی بەندایەتی و تـەوسیعە دان بـە وڵات و هەرێمی ئیسلامی و عیززەت و خۆشبەختی و بەرژەوەندی ئیمانداران، هیچ ئیسراحەتی نەكردووە تا وەفاتی كـردووە. لازمـە دەركـی ئـەوەت بـبێ و وا تێبگەی هیچ مەكـانێك لە مـەدینەدانـیە جـێگە پـێی ڕەسوولی خوای تێدا نەبێ. پێویستیشە بە شەرم و حیا و ئەدەبەوە هەنگاو هەڵبگری و بڕۆی بەڕێدا و لەگەڵ

هاوسێ و دراوسێ و ئەهلی مەدینەدا چەنەچەنێ نەکەی و موراعاتی قەداسەتی دەورووبەری پێغەمبەری خوا ﷺ بکەی، کارێ نەکەی کە عەمەڵت بسووتێ و بەتاڵ بێتەوە.

٢٠. کاتێ داخڵی «مسجدالنّبی» ئەبی ئەبێ وا بزانی دوای «مسجدالحرام» گەورەترین عەرسە و مەکانی سەر زەوییە و خوای گەورە بۆ پێغەمبەر و یارانی هەڵبژاردووە، ئەووەڵجار فەرزەکان لەوێ ڕچاو کراون، جێگە و مەکانی گەورەترین مەخلووقی خوایە لە حاڵەتی ژیان و نەمانا. ئەبێ بە خشووع و ڕێز و ئەدەبەوە واریدی ببی و تێیدا بمێنیتەوە، هیوا و ئارەزووت وابێ بە مەحزی ئەوە کە ئەچیتە ناوی خوای گەورە ئەتبەخشێ و قەڵەمی عەفووی بەسەر گوناهتا ئەکێشێ، ئەبێ وایش بزانی کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە هاتن و وێسان و ئەدەب و زیارەت کردنت ئاگایە، سڵاو و درووودت ئەبیسێ و ڕاز و نیازت دەرك

ئەكا و جوابیشت ئەداتەوە و ئەبێ داوای شەفاعەتی لێ بكەی و زۆر بەگەورە و بەرزی بزانی و ڕێزی لێ بگری و مەحەببەتی لە ڕەگ و مۆخ و مەغز و دڵ و دەروونتا نەقش بگرێ، تا تەواوی ئەندام و لەتائیفت نوورانی و پاكِ و ڕۆشن ببێتەوە و هێژای لوتف و ڕەحمەتی خوات ببێ.

## باسی زیارەتی پێغەمبەرﷺ
## لە مەدینەی مونەووەرەدا

حاجی، دوای ئەحكامی حەج و عومرە سوننەتە بە ئیخلاسەوە بكەویتە ڕێ بۆ زیارەتی قەبر و هەرێم و مەڵبەندی نێنەری خوا، خاوەنی عیززەت و كەرامەت و شەفاعەت و سوڵتان و بورهان و بوراق و میعراج، خاتەم و تاجی نێردراوان، ڕۆحی عەداڵەت و ڕاستی، كلیلی ڕەحمەت و بەهەشت و ئاشتی، ئاڵای مرۆڤایەتی و ناموس و شەرەف، نیشانەی بەرژەوەندی دونیا و ئاخیرەت.. دەلیلی خێرات و

بەختەوەری، سەرۆك و سەرداری كەونەین، هۆی هێز و نووری چاوان و خاوەنی دەرەجات، شانازی عەرەب و عەجەم، هەڵبژاردە و هێمن و فەریادرەس، دەریـای سـەخاوەت و دلێـری و شـەهامەت و هـیدایـەت، موژدەدەر و ترسێنەر و نوور و چـرای گـەل و هـۆز، ناسێح و وەكیل و كەفیلی پتەوكەرەوەی بیر و باوەڕی جوان و یەكتاپەرستی، هۆكاری پەیدا بوون و ڕزگـار كـردنی مـرۆڤ و پـەری، نـەجیبزادە و سـالار و سـەرپەرشتی نـەزان و زانـا و زانـایۆخ و كـەسدار و بێكەسان، دڵسۆزی هەتیو و فەقیر و هەژاران، حەكیم و لوقـمانی تـەواوی دەردان، بـەڕێز و حـەبیب و خـۆشەویستی یـەزدان، حـەزرەتی «محمّدالمصطفى» ﷺ.

*ـ كاتێك چاوت كەوت بە دار و دیواری مەدینەی مونەووەرە سونەتە بڵێی: «اللّٰهُمَّ هٰذا حَرَمُ رَسُولِكَ فَاجْعَلْهُ وِقايَة مِنَ النّارِ وَ أَمْناً مِنَ الْعَذابِ وَ سُوءِ

الْحِسٰابِ». ئەی خوای گەورە ئەمە حەرەمی ڕەسوولی تۆیە، هیوا و ئـاوات و ئـارەزووم ئـەمەیە بـیکەی بـە پارێزەرمان لە ئاگری دۆزەخ و بیکەی بـە مـەلجەء و پەنامان لە عەزابی ئاگر و لە بەدی حیسابمان.

※ـ کاتێك کە واریدی شاری مەدینە ئەبیت زۆر بە گەورەی بزانە و سەڵەواتی زۆر لە دیداری پێغەمبەر ﷺ بدە و سوننەتە ئەم دۆعایە بخوێنی: «بِسْمِ اللّٰهِ وَ عَلیٰ مِلَّةِ رَسُـولِ اللّٰـهِ ﷺ رَبِّ أَدْخِـلْنِي مُـدْخَلَ صِـدْقٍ وَ أَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَـدُنْكَ سُـلْطَاناً نَـصِيراً». بـە نـاوی خـوا و لەسـەر دیـن و ئـیمانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەی خوایا، داوات لێ ئـەکـەم و هیوا و ئارەزووم ئەمەیە داخڵی شاری مەدینەم بکەی، بـە داخـڵ بـوونێکی ڕاسـتی و بـمهێنیتە دەرەوە بـە دەرهێنانێکی ڕاستی و بی‌گێڕە بۆ من لەلایەنی خۆتەوە بە دەلیلێکی یارمەتی‌دەر.

※ـ پێغەمبەری خوا ﷺ فـەرموویەتی: «کـەسێ لە

دوای فەوتم زیارەتی من بكا، وەك ئەوە وایەكە لە حاڵی ژیان و حەیاتمدا زیارەتی كـردبم» یـا فـەرموویەتی: «كەسێ زیارەتی قەبری من بكا شەفاعەتی مـن بـۆی واجب ئەبێ» یا فەرموویەتی: «كەسێ بێ بۆ زیارەتم و نیازیتر نەیهێنابێ و تەنیا قەسدی زیارەتی منی بـێ، ئەوە بەلای خواوە حەقی سابتە كـە لە ڕۆژی قـیامەتا شەفاعەتی بكەم». كاتێك نزیكی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ كەوتیتەوە میقدارێك بـوەستە و لە دڵ و دەروونـتەوە كەسبی ئیجازەی لێ بكە و دوایی بە ئەدەبە لە دەرگای جوبرەئیلەوە بچۆرە ناو مزگەوتەكـەی پـێغەمبەرﷺ، ئەمجار قەسدی «روضە» بكەی، كە وا لە لەبەینی قەبر و مینبەری ڕەسوولی خواداﷺ. لە نزیك مینبەرەوە دوو ڕكات نوێژی سوننەت بكە. «ابن‌عبّاس» لە پێغەمبەری خواوەﷺ ڕیوایەت ئەكا كە فەرموویەتی: «یەك نوێژ لە «مسجدالنّبی» سەوابی دەهـەزار(١٠/٠٠٠) نـوێژی هەیە، یەك نوێژ لە «مسجدالأقصی» سەوابی یەك‌هەزار

نوێژی هەیە، یەك نوێژ لە «مسجدالحرام» سەوابی یەکسەدهەزار(١٠٠/٠٠٠) نوێژی هەیە».

پیغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: «مَنْ صَلّى فِي مَسْجِدِي أَرْبَعِينَ صَلاَةً لاَ تَفُوتَهُ صَلاَةٌ كُتِبَتْ لَهُ بَرَائَةٌ مِنَ النَّارِ وَ بَرَائَةٌ مِنَ الْعَذَابِ وَ بَرَائَةٌ مِنَ النِّفَاقِ»[1] کەسێ لەسەر یەك لە مزگەوتی مندا چل نوێژ بکات هیچ نوێژێکیان نەفەوتێنێ ئەوە بۆی ئەنووسرێ کە بەری ئەبێ لە ئاگر و لە سزاو عەزاب و نیفاق و دووروویی.

جا دوای دوو ڕکات نویژی سوننەت شوکر و سەنا و ستایشی خوا بکە لەسەر ئەو نیعمەتە گەورە کە بە تۆی داوە. پاشان دەست بکە بە زیارەتی پێغەمبەری خواﷺ بەو شێوەیە کە شەرع فەرموویەتی: ڕووبەڕووی قەبری فەخری عالەمﷺ ڕاوەستە و پشت بکەرە قیبلە و ڕوو بکە لە قەبری پێغەمبەری ئازیزﷺ،

(١) مسند احمد ج٢٥ ص١٦٩ رقم/١٢١٢٣. و جمع الجوامع او الجامع الكبير/٥٥٢٨ و قال رجاله ثقات.

بەڵام لەبەر ڕێز و ئیحتیرامی پێغەمبەر ﷺ چوار زیراع لە قەبرەکەیەوە دووربە و زۆر بە ئەدەبەوە بوەستە و دەنگ بەرز نەکەیتەوە؛ بێئیحتیرامی نەکەی و دار و دیواری قەبرەکەی ماچ نەکەی و دەستی پێوە نەدەی و ئاگات لە خۆت بێ زۆر بە ترس و «خشوع و خضوع» و ئیخلاسەوە ڕووبەڕووی قەبری موبارەکی بوەستە و خیتابی لێبکە و بڵێ: «السَّلامُ عَلَيْكَ يا رَسُولَ اللّٰهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا صَفْوَةَ اللّٰهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا نَبِيَّ اللّٰهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا أَمِينَ اللّٰهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا خِيرَةَ اللّٰهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا مُحَمَّدُ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا أَحْمَدُ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا أَبَا الْقاسِمِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا ماحِي، السَّلامُ عَلَيْكَ يا عاقِبُ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا حاشِرُ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا بَشِيرُ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا نَذِيرُ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا طَهُرُ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا طاهِرُ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا أَكْرَمَ وُلْدِ آدَمَ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا سَيِّدَ الْمُرْسَلِينَ يا خاتَمَ الدِّينِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا رَسُولَ رَبِّ الْعالَمِينَ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا قائِدَ

الْخَيْرِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا فاتِحَ الْبِرِّ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا نَبِيَّ الرَّحْمَةِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا هادِيَ الْأُمَّةِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يا قائِدَ الْغُرِّ الْمُحَجَّلِينَ، السَّلامُ عَلَيْكَ وَ عَلىٰ أَهْلِ بَيْتِكَ الَّذِينَ أَذْهَبَ اللّٰهُ عَنْهُمُ الرِّجْسَ وَ طَهَّرَهُمْ تَطْهِيراً، السَّلامُ عَلَيْكَ وَ عَلىٰ أَصْحابِكَ الطَّيِّبِينَ وَ عَلىٰ أَزْواجِكَ الطّاهِراتِ أُمَّهاتِ الْمُؤْمِنِينَ جَزاكَ اللّٰهُ عَنّا أَفْضَلَ ما جَزا نَبِيّاً عَنْ قَوْمِهِ وَ رَسُولاً عَنْ أُمَّتِهِ وَ صَلّى عَلَيْكَ كُلَّما ذَكَرَكَ الذّاكِرُونَ وَ كُلَّما غَفَلَ عَنْكَ الْغافِلُونَ، وَ صَلّى عَلَيْكَ فِي الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ أَفْضَلَ وَ أَكْرَمَ وَ أَعْلىٰ وَ أَجَلَّ وَ أَطْيَبَ وَ أَطْهَرَ ما صَلّىٰ عَلىٰ أَحَدٍ مِنْ خَلْقِهِ كَما اسْتَنْقَذْنا بِكَ مِنَ الضَّلالَةِ وَ بَصَّرَنا بِكَ مِنَ الْعِنايَةِ وَ هَدانا بِكَ مِنَ الْجَهالَةِ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلٰهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَ أَشْهَدُ أَنَّكَ عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ وَ أَمِينُهُ وَ صَفِيُّهُ وَ خِيرَتُهُ مِنْ خَلْقِهِ، وَ أَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ الرِّسالَةَ وَ أَدَّيْتَ الْأَمانَةَ وَ نَصَحْتَ الْأُمَّةَ وَ جاهَدْتَ عَدُوَّكَ وَ هَدَيْتَ أُمَّتَكَ وَ عَبَدْتَ رَبَّكَ حَتّىٰ أَتاكَ الْيَقِينُ، فَصَلّى

اللّٰهُ عَلَيْكَ وَ عَلىٰ أَهْلِ بَيْتِكَ الطَّيِّبِينَ وَ سَلَّمَ وَ شَرَّفَ وَ كَرَّمَ وَ عَظَّمَ». **جا ئەگەر کەسێ نەیئەتوانی هەمووی بڵێ**، یا **نەیئەزانی یا کات تەنگ بوو، ئەوە ئەگەر بڵێ** «السّلام علیك یا رسول الله» **کافی و بەسە. جا ئەگەر کەسێ تۆی کردبوو بە وەکیل کە سڵاوی ئەو پێشکەشی ڕۆحی پێغەمبەر ﷺ بکەی، ئەبێ بڵێی: لە وەکالەتی فڵانە کەسەوە** «السَّلامُ عَلَيْكَ يا رَسُولَ اللّٰهِ» ﷺ **یا بڵێ** «السّلام علیك یا رسول الله، مِنْ فُلانِ بنِ فُلانٍ، أَوْ فُلانُ بنُ فُلانٍ يُسَلِّمُ عَلَيْكَ يا رَسُولَ الله» ﷺ.

**پاشان بە قەدەری یەك «ذِراع» بێرە دواوە و سڵاو لە حەزرەتی ئەبووبەکری سیدیق ؓ بکە، چوون سەری موبارەکی حەزرەتی ئەبوبەکری سیدیق وا لەلای شانی موبارەکی پێغەمبەری خوادا ﷺ سەری موبارەکی حەزرەتی عومەریش وا لەلای شانی پیرۆزی حەزرەتی ئەبوبەکری سیدیقدا، خوایان لێ ڕازی بێ، دیسان بەقەدەر نیوگەزی تر بێرە دواوە و**

سڵاو لە حەزرەتی عومەری فارووق ﷛ بکـە. بـاش وایە ڕوو بکەیتە قەبرەکەیان و بڵێی: «السَّلٰامُ عَلَيْكُمٰا يٰا وَزِيرَيْ رَسُولِ اللّٰهِ وَالْمُعٰاوِنَيْنَ لَهُ عَلَى الْقِيٰامِ بِـالدِّينَ مٰادٰامَ حَيّاً وَالْقٰائِمَيْنِ فِي أُمَّتِهِ بَعْدَهُ بِأُمُورِ الدِّينَ تَتَّبِعٰانِ فِي ذٰلِكَ آثٰارَهُ وَ تَعْمَلٰانِ بِسُنَّتِهِ فَجَزٰاكُمَا اللّٰهُ خَيْرَ مٰـا جَزٰى وَزِيرَيْ نَبِيٍّ عَنْ دِينِهِ».

❋ـدوایـــی بـــڕۆ بـــۆلای ســـەری مـــوبارەکـی ڕەسوول‌الله ﷺ و لە بەینی مەرقەد و کۆڵەکـەیەکـا کـە ئێستا هەیە بوەستە و ڕوو بکەرە قیبلە و هەتا ئەتوانی بە دڵێکی خاوێن و پڕ لە مەحەببەتەوە حەمد و ستایشی خوا بکە و سەڵەواتی زۆر لە دیداری پێغەمبەر ﷺ بدە و ئەمجار بڵێ: «اللّٰهُمَّ إِنَّكَ قَدْ قُلْتَ وَ قَوْلُكَ الْحَقُّ: ﴿وَ لَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جٰاؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللّٰهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللّٰهَ تَوّٰاباً رَحِيماً﴾. اللّٰهُمَّ إِنّٰا قَـدْ سَمِعْنٰا قَوْلَكَ وَ أَطَعْنٰا أَمْرَكَ وَ قَصَدْنٰا نَبِيَّكَ مُسْتَشْفِعِينَ بِهِ إِلَيْكَ فِي ذُنُوبِنٰا وَ مٰا أَثْقَلَ ظُهُورَنٰا مِنْ أَوْذٰارِنٰا تٰائِبِينَ

مِنْ ذَلَلِنا مُعْتَرِفِينَ بِخَطٰايٰانٰا وَ تَقْصِيرِنٰا فَتُبْ عَلَيْنٰا وَ شَفِّعْ نَبِيَّكَ هٰذٰا فِينٰا وَارْفَعْنٰا بِمَنْزِلَتِهِ عِنْدَكَ وَ حَقِّهِ عَلَيْكَ، اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُهٰاجِرِينَ وَالْأَنْصٰارِ، وَاغْفِرْ لَنٰا وَ لِإِخْوٰانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونٰا بِالْإِيمٰانِ، اللّٰهُمَّ لٰا تَجْعَلْهُ آخِرَ الْعَهْدِ مِنْ قَبْرِ نَبِيِّكَ وَ مِنْ حَرَمِكَ يٰا أَرْحَمَ الرّٰاحِمِينَ». ئەی خوایا، بەڕاستی فەرمووتە و فەرموودەی تۆ حەقە: ئەگەر تەواوی خەڵکی لە نەفسی خۆیان زوڵم بکەن و بێن بۆ خزمەتی تۆ و داوای لێخۆش‌بوون لە خوا بکەن و پێغەمبەریش داوای لێخۆش‌بوونیان بۆ بکات، ئەوە تۆبەکەیان وەرئەگیرێ و ڕەحمیان پێئەکرێ. یاڕەببی بەڕاستی فەرموودەی تۆمان بیست و ئیتاعە و فەرمەنبەرداری ئەمرت ئەکەین و قەسدی پێغەمبەرەکەت ئەکەین و داوای لێئەکەین تا لە خزمەتی تۆدا شافیع و تکاکاری بەخشینی گوناهانمان بێ و هی ئەوەیش کە باری گران کردووین، لە خەتا و گوناهانمان پەشیمانین و ئیعتیراف بە خەتا و گوناه و کۆتایی کردنمان ئەکەین و

هـــيوا و ئـــومێدیشمان هـەیە كـە دەرەجـەمان بـەرز بكەیتەوە؛ ئەی خوایا، داوات لێ ئەكەم كە خۆش ببی لە هـــۆزی كـــۆچەران و یـــارمەتی‌دەران (مـهاجرین و انـــصار)، خـــۆش بـــبی لە گـــوناهی ئـــێمە و لەو بـــرا موسوڵمانانەمان كە بە ئیمانەوە پێشی ئێمە كەوتوون. ئەی خوای گەورە داوات لێ ئەكەم، ڕجات لێ ئەكـەم ئاوات و ئـارەزوو و ئـومیدم ئـەوەیە ئـەم زیـارەتمە نەكەیت بـە ئـاخرین زیـارەتی پـێغەمبەرەكـەت، وە ئاخرین زیارەتی حەرەمت.

دوایی بڕۆ بۆ «روضه» و دوو ڕكات نوێژی سوننەت بكـــە و لە زاتـــی یـەزدان داوای دیـن و دونـیا بكـە. پێغەمبەری ئـیسلام ﷺ فـەرموویەتی: «بـەینی مـاڵ و مینبەری مـن بـاغچەیەكـە لە بـاغەكـانی بـەهەشت، مینبەری من وا لەسەر حەوزی خۆمەوە».

سوننەتە لە ڕۆژی پێنج‌شەممەدا بڕۆی بۆ زیارەتی قەبری شەهیدان لە كێوی «أحـــد»، ســونەتە لە ڕۆژی

شەممەدا بڕۆی بۆ مزگەوتی «قُبا» و دوو ڕکات نوێژی سوننەت بکەی. پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: یەك نوێژ لە مزگەوتی قوبادا بکرێ سەوابی یەك عـومرەی هەیە. «للحديث الصّحيح في كتاب التّرمذي و غيره عن أُسيد بن ظهير رضي الله عنه أَنّ رَسُولَ اللّهِ ﷺ قالَ: صَلاةٌ فـي مَسْجِدِ قُبَاء كَعُمْرَةٍ»[1]. سوننەتە هەموو ڕۆژێ بڕۆی بۆ «بقیع» بەتایبەتی لە ڕۆژی جومعەدا زیارەتی حەزرەتی ئـیبراهـیمی کـوڕی پـێغەمبەری خـوا و حـەزرەتی عوسمان و حەزرەتی عەبباس و حەزرەتی حەسەن و حەزرەتی عەلی کوڕی حوسەین و موحەممەدی کوڕی عەلی و جەعفەری کوڕی عەلی و جەعفەری کـوڕی موحەممەد و سەفیەی پـووری ڕەسـوولی خـواﷺ و ماباقی ئەسحاب ـ خوا لە هەموویان ڕازی بێ ـ بکەی و بڵێی: «السَّلامُ عَلَيْكُمْ دارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَ إِنّا إِنْشاءَاللّهُ

(١) سنن ابن‌ماجه ج۴ ص ٣٣٠ رقم/١۴٠١.

بِكُمْ لَاحِقُونَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِأَهْلِ بَقِيعِ الْغَرْقَدِ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَنَا وَ لَهُمْ». سوننەتە هەموو فەرزەكان لە «مسجدالنّبی»دا بە جەماعەت ئەنجام بدەی. سوننەتە بڕۆی بۆ «خندق» و زیارەتی مزگەوتی «فتح» و ماباقی مزگەوتەكان بكەی. سوننەتە بڕۆی بۆ «مسجدالقبلتین» و ماباقی مزگەوتەكانی شاری مەدینە و لە هەركام لەو مزگەوتانەدا دوو ڕكات نوێژی سوننەت بكەی. سوننەتە ئەگەر بۆت مومكین بوو لە مەدینەدا ڕۆژوو بگری و سەدەقە و ئیحسان بە فەقیرانی دەوروبەری مزگەوتی پێغەمبەرﷺ بدەیت. كاتێك گەرەكت بوو بەرەو ماڵ بگەڕێیتەوە بە دوو ڕكات نوێژی سوننەت لە مزگەوتی پێغەمبەرﷺ خواحافزی بكەی و بچی بۆ زیارەتی قەبری ڕەسوولی ئازیزﷺ، وەك ئەووەڵجار زیارەتی كەیتەوە و سڵاوی لێبكەی و دوایی بڵێی: «اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلْهُ آخِرَ الْعَهْدِ مِنْ حَرَمِ رَسُولِ اللّٰهِ وَ يَسِّرْ لِيَ الْعَوْدَةَ إِلَى الْحَرَمَيْنِ سَبِيلاً سَهْلاً وَارْزُقْنِي الْعَفْوَ

وَالْعافِيَةَ فِي الدُّنْيا وَالْآخِرَةِ وَ رَدَّنا إِلىٰ أَهْلِنا سالِمِينَ غانِمِينَ». ئەی خوای گەورە، ڕجا و ئارەزوو و ئاواتم هەیە و داوات لێئەکەم ئەم زیارەتمە نەکەی بە ئاخرین زیارەتی حەرەمی ڕەسوولت، ڕجام هەیە و داوات لێئەکەم کە هاتنەوەم بۆ حەرەمەین سەهل و ئاسان بکەیت، یاڕەببی ڕجام هەیە کە لە دونیا و قیامەتا عەفو و عافیەت بکەی بە نەسیبم، داوات لێئەکەم بە سڵامەتی و سەروەتەوە بمانگەیێنیتەوە ناو ئەهل و ئەولادمان، ئامین.

## خاتمة

«قرطبی» فەرموویەتی: ئەووەڵ کەسێ کە پەردەی بە دەوری «بیت الحرام»دا کێشاوە «تبع الأول»ی حەمیری بووە، ئەڵێن «تبع الأول» یەکێك بووە لەو پێنج نەفەرانە کە بەسەر تەواوی دونیادا دەسەڵاتیان بووە و خاوەنی لەشکر و وەزیری زۆر بووە بەڵام لە کاتێکا ویستی بووە کە سەردان و سەیران بکا لە هەرێم و

ئەقالیمی دنیادا لە ناو وەزیرەكانیا بۆ تەدبیر و ڕاوێـژ كردن «عەماریا» هەڵئەبژێرێ و لەگەڵ یەك سەد هەزار زاناو دانا و تەبیب و حەكیمدا دەست بە سەردان ئەكەن. واریدی هەر ئەقلیم و هەرێمێ ئەبن ڕێز و ئیحترامـی زۆریان لێ‌ئەگرن و گەردنیان بۆ كەچ ئەكەن تا داخڵی شاری مەككە ئـەبن، بـەڵام خـەڵكی مـەككـە ڕێـز و ئیحتیرامیان لێ‌ناگرن و گوێیان پێ‌نادەن، «تبع الأول» زۆر نارەحەت و نیگەران ئەبێ بـە «عـەماریا» ئـەڵێ: ئەزانی كە خەڵكی مەككە لێمان ناترسن و ئـیتاعەمان ناكەن و ڕێزمان لێ‌ناگرن و سەرپێچی ئەكەن، عەماریا ئەیەوێ تەوجیهی بكا و ئەڵێ: خەڵكی مەككە عەرەبن و نەزان و لەگەڵ ئەمەشدا خاوەنی كەعبەن، ئەمجار «تبع الأول» پەیمان دەداكە «بیت» ئیبادە بكا و بیرووخێنێ و تەواوی پیاوانی بكوژێ و ژنەكانیان بكـا بـە كـەنیزە، بەڵام پارێزەی كەعبە تووشی دەردەسەری ئەكا و لە دەم و چاو و گوێچكە و لووتیا ئاوی بۆگەن جاری ئەبێ و

لەبەر بـۆگـەنیەکـەی کـەس نـاتوانـێ بـەقەدەر چـاو تروسکانێك لە لایا دانیشێ. جا «تـبع الأول» بـۆ ئـەم کارەساتە دائەچڵەکێ و بێدار ئەبێتەوە و بـە عـەماریا ئەڵێ: بۆ چارەسەر کردنی ئەم دەردە کە دامانگیری من بووە موشاوەرە بە زاناکان و حەکیمان و دوکتۆران بکە! ئەویش هەموویان کۆ ئەکاتەوە، ئەمما لە زیهن و فیکر و توانایی ئەوانا بە دەرە و ناتوانن چـارەسەری بکـەن، ئەڵێن: فیکر و نەزەری ئێمە بە سەر شتێکا ئەڕوا کە لە ئوموراتی زەوی بێ، بەڵام ئەم کارەساتە پەیوەندی بە ئوموراتی ئاسمانییە و لە تەوانـای ئـێمەدا بـە دەرە. وەزعی «تبع الأول»یش دەقیقە بە دەقیقە خراپتر ئەبێ. زانایەکیان بە عەماریا ئەڵێ: ئەگەر «تبع الأول» لەگەڵما ڕاست بکـا چـارەسەری ئـەکـەم، عـەماریایش زۆر مەسروور ئەبێ و بە «تـبع الأول» مـوژدە ئـەدا: کـەوا زانایەکیان فەرموویەتی من ڕێگەی چارەسەری دەردی «تبع الأول» ئەزانم، ئەمجا زاناکە لەگەڵیا دائەنیشێ و

پێی ئەڵێ: ئایا تۆ چ قەسد و مەرامێکت بە «بیت» بووە؟ ئەویش ئەڵێ: ئەمویست کە «بیت» ئیبادە بکەم و بیڕووخێنم و هەموو پیاوانی شاری مەککە بکوژم و ژنەکانیان بە دیل بگرم و بیانکەم بە کەنیزە، جا زاناکە پێی ئەڵێ: هەر ئەو قەسد و نیەتەیە وای کردووە بە تۆ، ئەگەر ئەتەوێ چاك ببیتەوە ئەبێ ئەو نیەت و قەسدە خراپە لە دڵی خۆتا دەربێنی، جا «تبع الأول» ئەڵێ: عەهد و پەیمان ئەدەم کە لەمەو دوا سووئی نیەتم بە «بیت» و بە ئەهلی مەککە نەمێنێ و حوسنی نیەت و قەسدی چاکەم بێ پێیان. فەوری شیفادەر شیفای بۆ ئەنێرێ و لە بۆگەنی نەجاتی ئەبێ. «خَلَعَ عَلَى الْكَعْبَةِ سَبْعَةُ أَثْوَابٍ وَ هُوَ أَوَّلُ مَنْ كَسَا الْكَعْبَةَ وَ خَرَجَ إِلىٰ يَثْرِبْ» دوایی ئەڕۆن بۆ مەدینە، بەڵام لەو کاتا مەدینە ناوی یەسریب بووە و ئاوەدان نەبووە، تەنها یەك چاوگەی تیا بووە، لەگەڵ لەشکر و زانایان و حەکیمان و دوکتۆراندا ئەچنە سەر چاوگەکە و دائەنیشن، زاناکان

دەركی ئەوە ئەكەن كە مەدینە ئەبێ بە جێگەی پێغەمبەری ئاخر زەمان، چوارسەد نەفەریان پەیمان بە یەكتر ئەدەن ئەگەر «تبع الأول»یش بیانكوژێ لە مەدینەدا نەچنە دەرەوە و هەر لەوێدا بمێننەوە، كاتێ كە «تبع الأول» بە پەیمانەكەیان ئەزانێ بە عەماریا ئەڵێ: چ حیكمەتێكی تێدایە ئێرەیان هەڵبژاردووە و نایەن لەگەڵمانا؟ عەماریا بانگیان لێ ئەكا و لێیان ئەپرسێ بۆ ئێرەتان هەڵبژاردووە؟ ئەوانیش ئەڵێن: لە ئاكامدا ئەم شوێنە ئەبێ بە شوێنی پێغەمبەری ئاخر زەمان، پیرۆزی و سەربەرزی و خۆشبەختی بۆ ئەو كەسەیە كە بە خزمەتی ئەگا و ئیمانی پێ ئەهێنێ و ئەبێ بە ئوممەتی، ئێمەش ئاوات و ئارەزوومان هەر ئەوەیە یا خۆمان یا ئەولادمان یا ئەولادی ئەولادمان بە خزمەتی بگەین و ئیمانی پێ بێنین. جا جوابەكەیان واله دڵی عەماریادا تەئسیر ئەكا ئەویش خواخوای ئەبێ كە لەگەڵیانا ئیقامە بكا و لەوێدا بمێنێتەوە. «تبع الأول»

كاتێ كە ئەيەوێ لەوێ بڕوا دووبارە بە زاناكان ئەفەرموێ بابڕۆین! ئاوانیش ئەڵێن تازە ئێمە نایەین و نیەتی ئیقامەمان هێناوە، حیكمەتەكەیشی عەرزی وەزیر جەنابی عەماریامان كردووە، ئەویش عەرزی «تبع الأول» ئەكا و حیكمەتەكەی واله دڵێ «تبع الأول»دا تەئسیر دەكا ئەویش حەز ئەكا لەوێ بمێنێتەوە، جا «تبع الأول» دەستوور ئەدا تا چوارسەد خانوو بە عەددی زاناكان بكەنەوە بۆیان و چوارسەد كەنیزەیان بۆ ئەكڕێ و ئازادیان ئەكا و لێیان مارەئەكا و پووڵ و پارەیەكی زۆریشان پێ‌ئەدا و پێشیان ئەفەرموێ: ئەبێ تا زەمانی پێغەمبەری ئاخر زەمان لەوێدا بمێننەوە، دوایی نامەیەكی جوان ئەنووسێ و مۆر و ئیمزای ئەكا و ئەیدا بە دەستی ئەو زانایەوە كە بە تەكبیر و ڕاوێژی ئەو چاك بووەتەوە و بەڵێنیشی لێ ئەسێنێ كە نامەكەی بدا بە دەستی پێغەمبەری ئاخر زەمانەوە ئەگەر بە خزمەتی بگات، ئەگینا وەسیەت

بکات بۆ ئەولادی و بۆ ئەولادی ئەولادی کە هەرکامیان بە خزمەتی بگات نامەکەی پێ بدات، دوایی «تبع الأول» باروبنەی خۆی ئەپێچێتەوە و لەگەڵ لەشکر و وەزیردا بۆ هیندوستان ئەڕوا و لەوێ فەوت ئەکا. بەینی فەوتی ئەو و بیعسەتی پێغەمبەری خودا هەزار ساڵ بووە.

بزانە! ئەو ئەسحابانە کە خەڵکی مەدینەن و مەشهوورن بە ئەنسار یاریدەری چینی کۆچەران بوون، لە نەوە و نەتەوەی ئەو زانا و حەکیمانەن کە لە «تبع الأول» جیا بوونەتەوەو لەوێ بەجێ ماون، بەر لە هیجرەتی پێغەمبەری ئازیز لە مەککەوە بۆ مەدینە، کۆڕی ئەنسار بە «عبدالرحمان»ی کوڕی عەوف موشاوەرە ئەکەن چۆن نامەکەی «تبع الأول» بنێرن بۆ پێغەمبەری ئازیز، ئەویش ئەفەرموێ: بیدەن بە دەستی پیاوێکی عاقڵ و ژیر و باوەڕ پێکراوەوە، ئەوانیش لە ناو ئەنساردا ئەبوو لەیلا هەڵئەبژێرن و نامەکەی

پیْ ئەدەن و وەسیەتیشی بۆ ئەکەن بە جوانی ئاگای لێی بێ و باش موحافەزەی لێوە بکات، ئەویش بە ئەدەب و ئیحتیرامەوە نامەکە هەڵئەگرێ و بەرەو مەککە ئەکەوێتە رێ، تا لە ناکاو بە خزمەتی پێغەمبەری ئازیز ئەگەیێت لە ناو هۆزی «بنی‌سلیم»دا، پێغەمبەری خودایش ئەبوو لەیلا ئەناسێ و بانگی لیْ ئەکا و پێی ئەفەرموێ: تۆ ئەبوو لەیلای؟ ئەویش عەرزی ئەکا بەڵێ، پێی ئەفەرموێ: نامەی «تبع الأول»ت پێیە؟ ئەبوو لەیلایش سەری سوڕ ئەمێنێ و ئەڵێ: بەڵێ من ئەبوو لەیلام، بەڵام من تۆ ناناسم وا ئەزانم کە تۆ ساحیر بی، پێغەمبەری خودایش فەرموویەتی: من «محمد، رسول اللّه»م و ساحیر نیم، ئەمڕا بە ئەدەبەوە نامەکەی پیْ ئەدا و ڕەسوولی خودایش لێی وەرئەگرێ و ئەیدا بە دەستی ئیمام عەلییەوە تا نامەکەی بۆ بخوێنێتەوە، ئەویش نامەکەی بۆ ئەخوێنێتەوە، پیغەمبەری خودایش کاتی کە دەقی نامەکەی «تبع الأول» ئەبیسێ، سیْ جار

ئەفەرموێ: «مرحباً بالأخ الصالح»، دوایی پێغەمبەری خودا بە ئەبولەیلای ئەفەرموێ: ئیتر تۆ بڕۆرەوە بۆ مەدینە و موژدە بە ئەهلی مدینە بدە کە بۆ ئەوێ کۆچ ئەکەم و دێم. بەڵێ پێغەمبەری خودا وەختێ واردی مەدینە ئەبێ تەواوی شەعبەکانی مەدینە ئاوات و ئارەزوویان ئەوە بووە کە میوانی ئەوان بێ و خۆیشیان بە وشترەکەیەوە هەڵواسیوە بەشکم سەرداری کەونەین بە میوانیان بێ، بەڵام ڕەهبەری نازدار فەرموویەتی: واز لە وشترەکە بێنن خۆی مەئموورە لە هەر شوێنێکا وێسا دائەبەزین. بەڵێ وشترەکە کاتێ ئەگاتە ماڵی «أبوایّوب»ی ئەنساری و ئەویسێ.

بزانە! ئەبوئەیووبی ئەنساری لە نەوەی ئەو زانایەیە کە «تبع الأول» بە ڕاوێژی ئەو چاك بووەتەوە، ئەمەش ئێوە و دەقی نامەکەی «تبع الأول» کە بۆ پێغەمبەری ئازیزی نووسیوە:

«إِلىٰ مُحَمَّدِ بنِ عَبْدِاللهِ وَ نَبِيِّ وَ رَسُولِهِ وَ

خٰاتَمِ النَّبِيّينَ وَ رَسُولِ رَبِّ الْعٰالَمينَ ﷺ مِنْ «تَبَع الْأَوَّلِ» الْحَميرِيِّ، أَمّٰا بَعْدُ، فَإِنّي آمَنْتُ بِكَ وَ بِكِتٰابِكَ الَّذي أُنْزِلَ عَلَيْكَ وَ عَلىٰ دينِكَ وَ سُنَّتِكَ وَ آمَنْتُ بِرَبِّكَ وَ بِكُلِّ مٰا جٰاءَ مِنْ رَبِّكَ، مِنْ شَرٰائِعِ الْإيمٰانِ وَالْإِسْلٰامِ فَإِنْ أَدْرَكْتُكَ فَبِهٰا وَ نِعْمَتْ، وَ إِلّٰا فَاشْفَعْ لي وَ لٰا تَنْسِني يَوْمَ الْقِيٰامَةِ فَإِنّي مِنْ أُمَّتِكَ الْأَوَّلينَ وَ قَدْ بٰايَعْتُكَ قَبْلَ مَجيئِكَ وَ أَنَا عَلىٰ مِلَّتِكَ وَ مِلَّةِ أَبيكَ إِبْرٰاهيمَ، ثُمَّ خَتَمَ الْكِتٰابَ وَ نَقَشَ عَلَيْهِ: لِلّٰهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَ مِنْ بَعْدُ»

واتە: لە لایەنی «تبع الأول الحميری»وە بۆ خزمەتی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلاّ نەبی و پێغەمبەری خودا و ئاخری پێغەمبەران و نێرراوی پەروەردگاری بوونەوەر، ئەممابەعد، بەڕاستی ئیمانم بە تۆ هێناوە و بڕوام بەو کتێبە هەیە کە بۆ تۆ هاتووە و من لە سەر دین و ڕێبازی سوننەتی تۆم و باوڕم بە خواکەی تۆ هەیە و بە تەواوی ئەو ئەحکام و بڕیاری ئیمان و ئیسلامە کە لە تەرەفی خوداکەتەوە بۆت هاتوون، ئەگەر خودا کردی

بە خزمەتت گەییم ئەوە زۆر جوان و باشە و ئیللا ئارەزوو و ئاواتم هەر ئەوەیە کە شەفاعەتم بۆ بکەی و لە ڕۆژی قیامەتیشدا منت لە بیر نەچێ، بە ڕاستی من لە ئوممەتی پێشینی تۆم و بە حەقیقەت بەر لەوەکە تەشریف بێنی و دەرکەوی بەیعەتم پێ کردوویت و لە سەر دینی تۆ و دینی باوکی تۆم حەزرەتی ئیبراهیم.

***

## بینای کەعبە

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكاً وَ هُدًى لِلْعَالَمِينَ﴾[1] یەکەم خانوو کە بۆ خوا پەرستی مرۆڤ دانرابێ ئەوەیە کە لە شاری مەککەدا بە بەرەکەت و شارەزای خەڵك دانراوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ الرُّكْنُ وَالْمَقَامُ يَاقُوتَتَانِ مِنْ يَاقُوتِ الْجَنَّةِ»[2] ئەم دوو بەردە

(١) آل عمران/٩٦.

(٢) سنن الترمذی/٨٠٤. مسند احمد/٦٧٠٥. رواه ابن حبان والبيهقی

**(«حجرالأسود» و مەقامى ئيبراهيم) دوو ياقووتن لە ياقووتەكانى بەهەشت.**

«قَالَ ﷺ: نَزَلَ الْحَجَرُ الْأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ»[1]
**«حجرالأسود» لە بەهەشتەوە هاتووەتە خوارەوە.**

«قَالَ ﷺ: إِنَّ لِهٰذَا الْحَجَرِ لِسَاناً وَ شَفَتَيْنِ يَشْهَدُ لِمَنْ اسْتَلَمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِحَقٍّ»[2] **بەڕاستى «حجرالأسود» لە ڕۆژى قيامەتا خاوەنى زوبانێك و دوو لێوە، هەركەس ئيستيلامى كردبێ بە حەق، شاهيدى بۆ ئەدا.**

**حەزرەتى عەلى و «فاضل»ى قەتادە و ئيبنوعەبباس ﷺ لە تەفسيرى ئايەتى ﴿وَ أَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَ عَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾[3]دا فەرموويانە: كاتێ پەروەردگار ئەمرى كرد**

باسناد صحيح.
(١) سنن الترمذى/٨٠٣ و حسّنه. جامع الكبير للسّيوطى/٧١٩٠.
(٢) مسند احمد/٢٢٧٥. رواه الطّبرانى و صحّحه ابن حبّان. و في رواية: «يَأْتي هٰذَا الْحَجَرُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا وَ لِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ يَشْهَدُ لِمَنْ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ» مسند احمد/٢١٠٥. (٣) حج/٢٧.

بە حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام تا خەڵکی شارەزا و بێدار بکاتەوە کە حەجیان لەسەر فەرز و واجب کراوە. حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام فەرمووی: ئەی خوایە جا دەنگی من بە کوێ دەگات؟! خوای گەورە پێی ئەفەرمێ: تۆ بانگەوازەکە بکە، گەیاندنی لەسەر من. ئینجا حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام ڕۆیشتە سەر کێوی «ابوقُبَیس»، لە ڕیوایەتێکی تردا چووە سەرکێوی «صفا» و لە ڕیوایەتێکی تردا ڕۆیشتە سەر «مقام» و بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد و فەرمووی: ئەی خەڵکینە پەروەردگارتانماڵێکی دروست کردووە و واجب و فەرزی کردووە لەسەرتان کە بێن و تەوافی ئەم ماڵەی خوا بکەن، تا لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارتان بێ و بەهەشت ببێ بە ماواتان، ئادەی وەرن وەڵامی بانگەوازەکەی پەروەردگارتان بدەنەوە و ئیجابەی دەعوەت بکەن و سەرپێچی مەکەن. خوای گەورەش بانگەوازەکەی بە تەواوی مەوجووداتی سەر زەوی ئەگەیێنێ و تەنانەت

بەوانەش کە وان لە سکی دایک و پشتی باوکیاندا تا ئاخر زەمان، جا هەرکامیان حەجی بۆ نووسرابێ بە وشەی «لبّيك اللّٰهمّ لبّيك» وەڵامیان داوەتەوە؛ جا هەرکەس یەك جار جوابی دابێتەوە یەك جار حەج ئەکا و هەرکەس دوو جار وەڵامی دابێتەوە، دوو جار حەج ئەکا و... ئەگەر کەسێکیش جوابی نەدابێتەوە ئەوە حەج ناکات.[1]

بزانن، بۆ یەکەمین جار کەعبە لە «زمرّد»ی سەوز دروست کراوە و لەناویا قەنادیلی بەهەشت هەڵواسراون، کاتێ کە لافاو و تووفانەکەی حەزرەتی نووح عليه السلام هەڵساوە لەبەر ئەوەی کە بەیت غەرق نەبێت خوای گەورە بەرزی کردووەتەوە بۆ ئاسمانی چوارەم و حەزرەتی جوبرەئیلیش «حجرالأسود»ی بردووە بۆ کێوی «ابوقُبَيس» و لەوێ هێقمی کردووە. تا زەمانی

(١) المستدرک على الصّحيحين/٣٤٢١. صفوة التفاسير و الدّرّ المنثور على تفسير الآية.

حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام شوێنی کەعبە هەروا خاڵی بووە و ئاوەدان نەکراوەتەوە. جا کاتێ خوای تەعالا حەزرەتی ئیسماعیل و ئیسحاقی بەخشی بە حەزرەتی ئیبراهیم، ئەمری پێ کرد کە بەیت سەرلەنۆ درووس بکاتەوە تا عیبادەتی تیا بکرێ. حەزرەتی ئیبراهیمیش ئەفەرمێ: ئەی خوای گەورە نەقشە و مەکانی بەیتم پێ نیشان بدە تا دروستی بکەمەوە، خوای تەعالایش بە ئەندازەی کەعبە پەڵە هەورێك ئەنێرێ و لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیمدا گەردش ئەکا و ئەڕوا تا ئەچنە مەککە، ئەمجار پەڵە هەورەکە لە مەکانی ئێستای بەیتا ئەوەستێ.

خوای گەورە بانگ لە حەزرەتی ئیبراهیم ئەکا و پێی ئەفەرمێ: بە ئەندازەی سێبەری ئەو پەڵە هەورە بێ کەم و زیاد بەیت دروست بکەرەوە. جا حەزرەتی ئیبراهیم ئەبێ بە بەنا و حەزرەتی ئیسماعیل ئەبێ بە بەردەس و

بەردی بۆ ئەهێنێ تا بە تەواوی کەعبە نۆژەن ئەکەنەوە.[١]

لە کیتابی مەککەدا ئەزرەقی ڕیوایەت لە موجاهیدەوە ئەکا کە: خوای گەورە شوێنی بەیتی، لە بڕێ ڕیوایەتدا:ماڵی بەیتی دوو هەزار ساڵ پێش دروست کردنی زەوی خەلق کردووە.[٢]

ئەزرەقی ئەفەرمێ: حەزرەتی ئیبراهیم کەعبەی بەپێی ئەم نەقشەیە نۆژەن کردەوە: بەرزییەکەی ٩ زیراع و درێژییەکەی لەلای «حجرالاسود»ەوە بۆلای ڕوکنی شامی ٣٢ زیراعە، پاناییەکەیشی لە تەرەفی پلووسکی ڕەحمەتەوە لە ڕوکنی شامییەوە بۆ ڕوکنی غەربی کە مەشهوورە بە ڕوکنی عێراقی ٢٢ زیراعە، درێژییەکەی لە تەرەفی ڕوکنی غەربییەوە و بەرەو ڕوکنی یەمانی ٣١

(١) تفسیر البغوی فی تفسیر آیة ١٢٨ من سورة البقره. تفسیر الكشّاف و تفسیر الخازن فی تفسیر آیة ١٢٧ من سورة البقره.
(٢) المستدرک علی الصّحیحین/٣٨٧٢. تفسیر القرآن العظیم للطّبرانی و تفسیر البغوی و تفسیر الخازن فی تفسیر آیة ١٢٧ من سورة البقره.

زیراع و پانایییەكەی لەلای ڕوكنی یـەمانییەوە بـەرەو لای «حجرالأسود» ٢٠ زیراعە.[1]

ماڵی بەیت دوانزە جار بینا و نـۆژەن كـراوەتـەوە:

١.مـــەلائیكە. ٢.ئـــادەم. ٣.«شـــیف». ٤.ئـــیبراهـــیم. ٥.«عـــمالِق». ٦.جـــورهوم. ٧.«قُـــصَی». ٨.قـورەیش. ٩.«عـــبدالله»ی كـــوڕی زوبـەیر. ١٠.حـەججاج. ١١. مەسعوود. ١٢.مورادی كوڕی عوسمان.

***

لە كۆتاییدا: لەسەر حاجییان و عومرەگوزاران لزم و پێویستە كە كات و وەختیان بە غـەنیمەت بـزانـن و خەریكی خواپەرستی و تاعەت و عیبادەت بن، تا بە قازانج و ئەجر و پـاداش و ڕەزایـەتی پـەروەردگار و خۆش بوون لە تاوان و خەتاوە بگـەڕێنەوە. زانـایانی گەورە و پێشەوایان وەك «مُجاهِد» و «احمد بن حنبل» و

(١) محمد رسول‌الله ص ٤١.

«حسن‌بصری» ﷬ فەرموویانە: یەك ڕۆژ لە مەككەدا بەڕۆژوو بی، سەواب و پاداشی یەكسەد هەزار ڕۆژی هەیە. یەك دیرهەم بدەی بە هەژاران، پاداشی یەكسەد هەزار دیرهەمی هەیە. وە هەر چاكەیەك پاداشی یەكسەر هەزار چاكەی هەیە.

***

وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ

وَصَلَّى اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ

تەواو بوو لە ١٣٨٦/٨/١٠ی هەتاوی

بەرامبەر بە ١٤٢٨/١٠/٢١ی مانگی.

پێدا چوونەوە و لەسەر زیاد كردنی

بەهاری ١٣٩٠ كۆچی و ٢٧١١ كوردی

## ناوەرۆك